پرۆگرامی
پەروەردەیی
منداڵان



# بەرنامەی پەروەردەیی منداڵان

## قۆناغی یەکەم

ئامادەکردنی : محمد سینەمۆکی

چاپی سێیەم ١٩٩٩ـ١٤٢٠



هەولێر نووسینگەی تەفسیر بۆ چاپکردن و بڵاوکردنەوە



# پروگرامی
# پەروەردەیی منداڵان

ئامادەکردنی : محمد سینە مۆکی

قوناغی یەکەم



# بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

ان الحمدلله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور انفسنا ومن سيئات اعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له اشهد ان لااله الاالله وحده لاشريك له واشهد ان محمدا عبده ورسوله (صلى الله عليه وسلم)...

«يا ايها الذين امنوا اتقوا الله حق تقاته ولا تموتن الا وانتم مسلمون»

يا ايها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا كثيرا ونساءاً واتقوا الله الذي تساءلون به والارحام ان الله كان عليكم رقيباً».

«يا ايها الذين آمنوا اتقوا الله وقولوا قولا سديدا، يصلح لكم اعمالكم ويغفر لكم ذنوبكم ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما».

اما بعد: فأن اصدق الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد (صلى الله عليه وسلم) وشر الامور محدثاتها وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار...

هەر کۆمەڵێك کە بیەوێت جارێکی تر ئایینی خوا بێتەوە سەر شانۆی ژیانو گۆڕانکاری سەرتاسەری دروست بکاتو بارو دۆخ لە دەورو بەریدا بگۆڕێتو کاریگەری هەبێت لەژیانو واقعدا پێویستە گرنگی‌یەکی زۆر بداتە ساواو جگەر گۆشەکان ،و پەروەردەیان بکات بە پەروەردەیەکی پێویست تا بگەنە ئاستێکی وەها کە بتوانن ببنە هەڵگری ئەم دینەو خۆیانو خەڵکیشی لەسەر گۆش بکەن.

ئیسلام گرنگی‌یەکی زۆری داوەتە منداڵ وەهەر لە سەرەتای پەیدا بوونیەوە بەرنامەو ئامۆژگاری تایبەتی داناوە کە چۆن پێ بگاتە دروست ببێت، پێغەمەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (علموا اولادكم الصلاة اذا بلغوا سبعا واضربوهم عليها اذا بلغوا عشرا وفرقوا بينهم في المضاجع) سلسلة الاحاديث الصحيحة رقم (٣٤٢)..

واتە: (منداڵەکانتان فێری نوێژ بکەن کاتێك گەیشتنە حەوت ساڵانە، وەلێیان بدەن لەسەر نوێژ کاتێ گەیشتنە دە ساڵانە ، وەجێگای خەوتنیان لێ جیا بکەنەوە، واتە با لەژێر یەك جێگادا نەخەون بەیەکەوە.

هەروەها ( سەعدی کوڕی وەقاص ) دەڵێت : ( كنا نعلم اولادنا مغازي رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) كما نعلم السورة من القران ) .
واتە : ( ئێمە منداڵەکانمان فێری غەزاکانی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەکرد هەروەکو چۆن فێری سورەتێکی قورئانمان دەکردن ) .
گرنگیو ئەرکی مامۆستاش بەرامبەر منداڵان بریتییە لەدۆزینەوەو دەرهێنانی ئەو هێزو توانایەی کە خوا بە منداڵی بەخشیوەو گۆڕینی بۆ کرداری واقعێك ، بەهۆی ئەو کەرەستە ( وسيلة ) پەروەردەییە کاری گەرانەی کەلەگەڵ تەمەنی منداڵدا دەگونجێت بێ گومانیشە دڵو دەرونی منداڵ وەك پەڕەیەکی سپی بێ گەرد وایەو ئامادەیە بۆ کێشانی نەخشەو نیگای ئاسمانی توانای چەسپاندنو وەرگرتنی رۆژ لە دوای رۆژ لەبەرز بوونەوەدایەو رەنگدانەوە لە رۆژانەی ژیاندا ئاسانەو بەردەوامی تێدا دروست دەکرێت .
لەبەر ئەوە پێویستە گرنگییەکی زۆر بدرێتە منداڵانو هەنگاوی رۆژانەی لەگەڵدا هەڵبگیرێتو هۆکانی پەروەردەو پێگەیاندنی لەگەڵدا بەکار بهێنرێت تا بێتە نەوەی ئەمڕۆو پیاوی پاشەڕۆژ ، وەتا ببێتە نەوەی دواڕۆژی ئەم بەرنامەیەو نوێنەری راستەقینەی ئەم پەیامە خواییە .
لەبەر ئەنجامدانی کاری پەروەردەو پێ گەیاندنی منداڵانی ئەم نەوەیە هەستاین بە ئەرکی سەرشانمان بەرامبەر بە پەیامو بەرنامەی خواو پێگەیاندنی منداڵان لە شێوەیەکی ئامادە کراو بەهێز کە بتوانێت بێتە مەیدانی بانگەوازو کار کردن ، بۆیەکخستنی شێوازی پەروەردەی منداڵان هەستاین بە دانانی پرۆگرامی پەروەردەو پێگەیاندنی منداڵان کە لە سێ قۆناغ پێك دێت :

١. قۆناغی یەکەم: بریتییە لە قوتابیانی پۆلی یەکەمو دووەمو سێهەمی سەرەتایی.
٢. قۆناغی دووەم: کە بریتییە لە قوتابیانی پۆلی چوارەمو پێنجەمو شەشەمی سەرەتایی.
٣. قۆناغی سێیەمو کۆتایی: کەبریتییە لە قوتابیانی پۆلی یەکەمو دووەمو سێهەمی ناوەندی.

لە کۆتاییدا بە هیوای لێ بوردنی خوای بەبەزەیینو داوای دوعای خێریشتان لێ دەکەین لەکاتی بەدی کردنی هەر هەڵەو کەمو کورتییەك .
وە داواکارین کە ئەم پرۆگرامە ببێتە چرایەکی روناك بەدەستی بانگ خوازانەوەو کاری بانگخوازو پەروەردەی پێ بەهێز ببێت . .

﴿وان الله لهادي الذين آمنوا الى صراط مستقيم﴾..

# چەند سەرنجێك بۆ مامۆستا:[1]

ئەو مامۆستایانەی کە هەڵدەستن بە پەروەردەکردنی ساواو خونچە پێگەیشتووەکانو پێگەیاندنیان پێویستە ئاگاداری ئەم خاڵانەی خوارەوە بن:

١. تۆ لە ئاستو پلەیەکی بەرزدایتو منداڵو قوتابیانیش لە ئاستێکی نزمی ژیریو زانیاریدان، پێویستە تۆ بەپێی ئاستی ژیریو زانستی ئەوان بدوێیت.

٢. منداڵ هەمیشە وزیەکی تێدایەو سروشتی وایە حەز دەکات ئەو وزەیە بەکار بهێنێت، کەواتە کپ کردنەوەی ئەو وزەیە لە منداڵدا سەرەنجامی خراپی دەبێت.

٣. منداڵ هەمیشە سروشتی لاسایی کردنەوەی تێدا بەهێزەو بۆیە پێویستە مامۆستا زیاتر کرداری بێت نەك وتەو گفتاری.

٤. منداڵ سروشتی لەبیر چوونەوەی زۆر تێدایە لەبەر ئەوە ئاگاداربە نابێت زۆر پشت بە ئامۆژگاریو ئاراستە کردن ببەستیت بۆ پێگەیاندنیان بەڵکو پێویستە هەمیشە چاودێریو لێ پرسینەوەیان هەبێت.

٥. منداڵ هەمیشە حەز لە پێکەنینو یاریو گاڵتەو گەپ دەکات، لەبەر ئەوە پێویستە بەشێك لە پەروەردەی منداڵ بریتی بێت لە جووڵەو قسەی خۆشو نوکتەی پاك.

٦. منداڵ هەمیشە هەستی پێش برکێو موونافەسەی تێدایە بۆیە پێویستە ئەو هەستە بەکار بهێنرێت لەبواری زیرەکیو دانایدا بەوەی کە جار جار پێش برکێی قورئان لەبەر کردنو تاقی کردنەوە هەبێتو دیاری دابەش بکرێت بەسەریاندا.

٧. لاواندنەوەو نازدان بەقوتابی کاری خۆ دەکات لە پەیوەست کردنی منداڵ بەمزگەوتەوە، بۆیە دەبێ دوور بێت لە توورە بوونو لێدانو تەریق کردنەوە.

٨. هەوڵدان بۆ دروست کردنی تیپی سروودو وەرزشو پێش برکێ کردن پێیان.

٩. منداڵ لەسەرتادا لە سێ شوێنەوە ئاراستە دەکرێت (ماڵ، قوتابخانە، کۆڵان) دەبێ مامۆستا ئاگاداری هەرسێ جۆری ئاراستە کردنەکە بێت تا زاڵ بێت بەسەر دەروونو رەوشتی ئەو منداڵەدا.

١٠. هاندانی منداڵان لەسەر خوێندنی قوتابخانەو کۆشش کردن بۆ چالاکی لەوانەکانیاندا.

١١. لەکاتی پەروەردەی منداڵدا پێویستە پشت ببەستن بەو نوسراوو بڵاوکراوانەی کەهەن بۆ منداڵان بەتایبەت ئەوانەی کە وێنەیان تێدایەو تایبەتن بە منداڵانەوە بدرێت پێیان بۆ خوێندنەوەو سەیر کردنیانو پاشان پرسیاریان لێ بکرێت دەربارەی نوسراوەکان.

١٢. پۆل پۆل کردنی منداڵان لەناو مزگەوتداو هەر پۆلەی بدرێتە دەست مامۆستایەكو ئەویش سەرپەرشتی پۆلەکەی خۆی بکات.

١٣. پێویستە مامۆستا لێپرسینەوەی هەبێتو هەواڵی ئەو قوتابیانەی کە ئامادە نابنو دوا دەکەون بپرسرێتو هۆی دواکەوتنەکەیان بزانێتو بۆ ئەوەی لە پرۆگرامەکە دوانەکەونو هەست بە دڵسۆزی مامۆستاکە بکەن.

# چەند تێبینییەك:

١- قۆناغی یەکەم پێش سەرەتایش دەگرێتە خۆی .
٢- هەر قۆناغە بۆ ماوەی ساڵێك دەبێت .
٣- وانەکان پێویستە بە قوتابی لەبەر بکرێن.
٤- پێویستە ئەو وانانەی کە کردارین ( عملي ) مامۆستا خۆی لـ بەر چاویاندا ئەنجامیان بدات هەروەها بە قوتابیەکانیشی ئەنجام بدات .
٥- پێویستە مامۆستا بۆ قوتابیەکان لەگەڵ خوێندنی هەر وانەیەکدا بەوانەی رابردوودا بچێتەوە .
٦- پێویستە مامۆستا پابەندی وانەکانی ( منهج ) بێتو لێی کەم نەکاتەوە بەهیچ جۆرێك .
٧- دەبێت ئاگاداربین لەم پرۆگرامەدا کەزۆر منداڵو ساوا هەن زۆر چالاكو زیرەکن کە توانایان زیاترە ، پێویستە ئێمە زۆرترو زووتر پرۆگرامەکەیان لەگەڵ ببرینو توانەکەیان کەپت نەکەین . ( لكل قاعدة شواذ ) .
٨- پێویستە هەرسێ مانگ جارێ تاقی کردنەوەی قوتابیان بکرێت لەو وانانەی کە خوێندویانە لەم پرۆگرامە لەگەڵ دانانی ( پلە ) بۆ رادەی زیرەکی قوتابیان .
٩- پێویستە هەر هەفتەیەك وانەیەك لەبەشێك بخوێنرێت بو نموونە :
هەفتەی یەکەم : وانەی یەکەم لەبیروباوەڕ .
هەفتەی دووەم : وانەی یەکەم لە بەشی خواپەرستی . .
هەفتەی سێیەم : وانەی یەکەم لە بەشی خوڕەووشت . . . . . هتد بەم شێوەیە . .
١٠- پێویستە قوتابی وانەی بەشی فێرکردنی بەردەوام هەبێت لە رۆژەکانی هەفتەدا بەپێی تواناو بۆ گونجان .

# قۆناغی یەکەم

مناڵانی پۆلی یەکەمو دووەمو سێیەمی سەرەتایی دەگرێتە خۆی:

## آ) بەشی فێرکردن

١. مامۆستا هەڵدەستێت بەفێرکردنی پیتەکانی زمانی عەرەبی ( الحروف الهجائية ) بۆ قوتابی .
٢. فێر کردنی بزواوەکان ( الحركات ) کە بریتین لە ( سەر «فتحة» ، بۆر «ضمة» ، ژێر «كسرة» ، شەددە«ـّ» ، زەنە «سكون» ، مەددە «ـٓ» ، هەڵکشاو «آ» ، داکشاو «إ» ، دوو سەر «ـً» ، دوو بۆر «ـٌ» ، دوو ژێر «ـٍ» .
٣. دەست پێکردن بە فێرکردنی قورئانی پیرۆز لە سوورەتە بچوکەکانی جوزئی ( عمّ ) بەڵام بە حونجەیی بەمەرجێك نابێت لە نیوەی جوزئەکە کەم تر بێت وە تەواو کردنی پاش ماوەی جوزئەکە بەشێوەی خوێندنەوە .
٤. لەبەر کردنی قورئان بەپێی ئاستی قوتابیان بەمەرجێك لە سورەتی ( فاتحەو ومعوذتين ) کەمتر نەبێت .

## ب- بەشی بیروباوەڕ

### پایەکانی ئیمان (اركان الايمان):

١- باوەڕ بەخوا.
٢- باوەڕ بەفریشتەکانی خوا.
٣- باوەڕ بە کتێبەکانی خوا.
٤- باوەڕ بە پێغەمبەرانی خوا.
٥- باوەڕ بە ڕۆژی دوایی.
٦- باوەڕ بەقەزاو قەدەر.

وانەی یەکەم:

## ١- باوەڕ بەخوا:

باوەڕ بەخوا : واتە بڕوا بوون بەوەی کە خوای پەروەردگار ئێمەو هەموو بوونەوەری لە نەبوونەوە دروست کردووەو تاكو تەنهایەو بێ هاوەڵەو ژیانو مردنو بەڕێوەبردنی بوونەوەرو ...... بەدەستە هەر ئەو شایانی پەرستنە .

پرسیار-١ : خوا ناوی چییه ؟
وەڵام: «الله».
پرسیار-٢ : کێ ئێمەو زەویو ئاسمانو هەموو بوونەوەری دروست کردووە ؟
وەڵام: «الله».
پرسیار-٣ : کێ دەمان ژێنێ ؟
وەڵام: خوا دەمان ژێنێو رۆزیمان دەداتو گیانمانی بەدەستە.
پرسیار-٤ : کێ بەڕێوەبەری ئێمەو زەویوئاسمانەکانو مانگو رۆژە ؟
وەڵام: خوای پەروەردگار بەتەنها بەڕێوەبەری هەموویانەو پێویستی بەیارمەتی کەسی تر نییە.
پرسیار-٥ : کێ شایانی پەرستنە ؟
وەڵام: تەنها (الله) شایستەی پەرستنە.
پرسیار-٦ : کەواتە کێ لە هەموو کەس خۆشەویستترە ؟
وەڵام: خوا (الله)..
تێبینی: مامۆستا دەتوانێت بەویستی خۆی کۆمەڵێك پرسیاری تر بەپێی پێویست ئاراستەی قوتابیان بکات بۆ نموونە: (کێ تامو رەنگی بەخشیووە بەمیوەهات ؟ کێ ئەم شێوە جوانەی پێ بەخشیوین ؟ ..... هتد .

وانەی دووەم:

## ٢- باوەڕ بەفریشتەکانی خوا (الملائکة):

باوەڕ بەفریشتەکان: واتە بڕوابون بەوەی کە فریشتەکان دروست کراوی خوانو وە لە رووناکی دروستی کردوون، ئێمە نایان بینین وهەمیشە خەریکی خواپەرستینو هەرگیز لە فەرمانی خوا دەرناچن وەنێرو مێیان نییەو خواردنو خواردنەوەشیان نییە.
پرسیار١ : فریشتە چین ؟
وەڵام: جۆرە دروست کراوێکی خوای پەروەدگارنو کە خوا لە رووناکی (نور) دروستی کردوون.
پرسیار-٢ : ئایا ئێمە دەتوانین بیان بینین ؟
وەڵام: نەخێر.
پرسیار-٣ : ئایا خواردنو خوارنەوەیان هەیە ؟
وەڵام: نەخێر.
پرسیار-٤ : ئایا نێرو مێیان هەیە ؟
وەڵام: نەخێر.
پرسیار-٥ : ئایا بۆچی دروست کراون ؟
وەڵام: بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوا.
پرسیار-٦ : ئایا لە فەرمانی خوا دەردەچن ؟
وەڵام: نەخێر هەرگیز لە فەرمانی خوا دەرناچن.

وانەی سێیەم:

# ٣- باوەڕ بەکتێبەکانی خوا

باوەڕ بەکتێبەکانی خوا: واتە بڕوا بوون بەو کتێبانەی کەخوای گەورە ناردوونی بۆ پێغەمبەران، تاخەڵکی بەهۆیانەوە خوا بناسنو بیپەرستن.

پرسیار-١: بەهۆی کێوە ئەو کتێبانەی ناردووە؟
وەڵام: بەهۆی فریشتەیەکەوە کە ناوی (جبریل)ە.

پرسیار-٢: ئەو کتێبانەی کەناویان هاتووە لە قورئاندا کامانەن؟و بۆ کێ هاتوون؟
وەڵام: صحف ـ بۆ ابراهیم (علیه السلام).
تەورات ـ بۆ موسی (علیه السلام).
زەبور ـ بۆ داود (علیه السلام).
ئینجیل ـ بۆ عیسی (علیه السلام).
قورئان ـ بۆ محمد (صلی الله علیه وسلم).

پرسیار-٣: کۆتایین کتێبی خوا کامەیان بوو؟
وەڵام: قورئانی پیرۆزە.

وانەی چوارەم:

# ٤- باوەڕ بەپێغەمبەرانی خوا

باوەڕ بەپێغەمبەرانی خوا: واتە بڕوا بوون بەو پێغەمەرانەی کەخوا لەناو ئادەمیزاددا هەڵی بژاردوون تاکو بەرنامەی خوا بگەیەنن بەخەڵکی سەر زەوی.

پرسیار-١: ئایا باوەڕهێنان بەهەموویان پێویستە؟
وەڵام: بەڵێ پێویستە بڕوامان بەهەموویان هەبێت بەبێ جیاوازی.

پرسیار-٢: ئایا پێغەمبەران چی بوون؟
وەڵام: ئادەمیزادی نێرینە بوون.

پرسیار-٣: ژمارەی ئەو پێغەمەرانەی کە لە قورئانو سوونەتدا هاتوون چەندن؟
وەڵام: تەنها ناوی (٢٥) پێغەمبەر هاتووە.

پرسیار-٤: ئایا بۆ هەموو گەلێك خوا پێغەمبەری ناردووە؟
وەڵام: بەڵێ.

پرسیار-٥: خوای گەورە پێغەمبەرانی بۆچی ڕەوانە کردووە؟
وەڵام: تا خەلکی خوا بناسنو بیپەرستنو لە سنوری ئەو دەرنەچن.

پرسیار-٦: کۆتایین پێغەمبەر کامەیە؟
وەڵام: پێغەمبەرمان «محمد» (صلی الله علیه وسلم).

وانەی پێنجەم:

# ٥- باوەڕ بەڕۆژی دوایی

باوەڕ بەڕۆژی دوایی: واتە بڕوا بوون بەو ڕۆژەی کەخوا هەموو گیان لەبەران زیندوو دەکاتەوەو لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکاتو پاداشتو سزای خەڵکی دەداتەوە

بەبەهەشتو دۆزەخ.

پرسیار-١ : ئایا جگە لەم ژیانی دنیا ژیانی تر هەیە؟

وەڵام: بەڵێ زیندوو بوونەوە لە رۆژی دواییدا.

پرسیار-٢ : رۆژی دوایی کەی دێت؟

وەڵام: تەنها خوای گەورە دەزانێ کەی دێت.

پرسیار-٣ : ئایا رۆژی دوایی بۆچی‌یە؟

وەڵام: بۆ وەرگرتنی پاداشتی چاکەو سزای خراپەیە لەسەر کردەوەکانی دونیا.

پرسیار-٤ : ئایا پاداشتی چاکەکارانو سزای تاوانباران چی‌یە؟

وەڵام: پاداشتی چاکەکاران بەهەشتەو تاوانبارانیش دۆزەخە.

پرسیار-٥ : بەهەشت چی‌یە؟

وەڵام: ئەو شوێنەیە کە خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ بڕواداران کە پڕیەتی لەهەموو نازو نیعمەتو خواردنەوەی هەمە جۆر.

پرسیار-٦ : دۆزەخ چی‌یە؟

وەڵام: ئەو شوێنەیە کەخوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ بێ باوەڕو تاوانباران کە پڕیەتی لەهەموو جۆرە سزاو ئەشکەنجەو ئازارێکی ترسناک.

وانەی شەشەم:

## ٦- باوەڕ بەقەزاو قەدەر

باوەڕ بەقەزاو قەدەر : واتە بڕوا بوون بەوەی کەهەر خۆشی‌و ناخۆشی‌و جەو جوڵێك کە روو دەدات لەلایەن خواوەیەو بەویستی خۆی هەڵی دەسوڕێنێت.

پرسیار-١ : ئایا هەر شتێك کەروو دەدات بە ئاگاداری کێ‌یە؟

وەڵام: هیچ شتێك بێ ئاگاداری خوای گەورە روو نادات.

پرسیار-٢ : ئایا هەموو خۆشی‌و ناخۆشی‌یەكو تاڵی‌و شیرینی‌یەك بەدەست کێ‌یە؟

وەڵام: هەموی بەدەستی خوای گەورەیە بەتەنها.

پرسیار-٣ : ئایا لەکاتی روودانی تەنگو چەڵەمەدا دەبێ چۆن بین؟

وەڵام: پێویستە پێی رازی بین چونکە قەزار قەدەری خوای گەورەیە.

---


**سەرچاوەکانی بەشی بیرو باوەڕ :**

١- شرح اصول الایمان ـ محمد ابن صالح العثیمین.

٢- خوا پەرستی لەئیسلامدا ـ احمد کاکە محمود.

٣- مختصر شرح عقیدة الطحاوي ـ

٤- الایمان ـ د. محمد نعیم یاسین.

٥- بیرو باوەڕ ـ م.علی باپیر.

# ج- بەشی خوا پەرستی (العبادة)

**(وانەی یەکەم):**

**خوا پەرستی (العبادة):** بریتی‌یە لە گەردن کەچ کردنو یەکتایی خوا لەپەرستن‌داو دڵسۆزی لەهەموو کارو بارێکدا بۆی وەبڕوا هێنان بەهەموو یاساو بناغەکانی ئیسلام.

## پایەکانی ئیسلام

**پرسیار-١:** پایەکانی ئیسلام چەندن؟ کامانەن؟

**وەڵام:** پایەکانی ئیسلام پێنجن کە بریتیین لە

١) شایەتمان.

٢) نوێژ کردن.

٣) زەکات دان.

٤) ڕۆژوی مانگی رەمەزان.

٥) حەج کردن.

# ١- شایەتمان (الشهادتان).

**شایەتمان:** واتە شاهێدی‌دان بەوەی کەهیچ پەرستراوێکی بەراستی نی‌یە تەنها (الله) نەبێت وەشاهێدی‌دان بەوەی کە «محمد» پێغەمبەرو رەوانە کراوی خوایە.

**پرسیار-١:** شایەتمان چی‌یە؟

**وەڵام:** بریتی‌یە لەوتنی «اشهد ان لااله الا الله - واشهد ان محمدا رسول الله»

**پرسیار-٢:** شایەتمان داوای چیمان لێ دەکات؟

**وەڵام:** داوامان لێ دەکات کەدان بنێین بەوەی کەکەس شایانی پەرستن نی‌یە جگە لە (الله) وەدان نان بەوەدا کە (محمد) نێرراوی راستەقینەی خوای گەورەیە.

**پرسیار-٣:** نیشانەی موسڵمان بونی مرۆڤ چی‌یە؟

**وەڵام:** وتنی هەردوو رستەی شایەتمانە بێ دوو دڵی.

**(وانەی دووەم):**

# ٢- نوێژ کردن:

**نوێژ کردن:** بریتی‌یە لە پایەی دووەم لە پایەکانی ئیسلام کەخوای گەورە لەشەو رۆژێکدا پێنج جار پێویستی کردووە لەسەر ئێمە.

**پێویستی‌یەکانی نوێژ**

**پرسیار-١:** پێویستە پێش نوێژ چی بکەین؟

**وەڵام:** پێویستە لەسەرمان دەست نوێژ بگرین پێش ئەوەی نوێژ بکەین.

پرسیار.٢ : چۆن دەست نوێژ دەگرێت؟
وەڵام: ١ـ نیەت هێنان بەدڵ.
٢ـ شۆردنی دەم‌و چاو.
٣ـ شۆردنی هەردوو دەست لەگەڵ ئانیشکەکانی.
٤ـ دەست هێنان بەتەڕی بەسەر سەردا (مسح الرأس).
٥ـ شۆردنی هەردوو پێکان لەگەڵ قولە پێکاندا (گوێزنگ).
٦ـ ئەنجامدانی ئەم خاڵانە بەڕیزو بەبێ پاش‌و پێش خستنی.
تێبینی : پێویستە مامۆستا خۆی بەکردار فێری دەست نوێژ گرتنیان بکات.

## (وانەی سێیەم):

پرسیار.١ : لەشەوو رۆژێکدا چەند جار بانگ دەدرێت؟
وەڵام: لەشەوو رۆژێکدا پێنج جار بانگ دەدرێت.
پرسیار.٢ : چۆن بانگ دەدرێت؟ وەماناکەی چییە؟
وەڵام: بەم شێوەی خوارەوە بانگ دەدرێت:

| | |
|---|---|
| الله اکبر الله اکبر | : خوا لەهەموو شتێ |
| الله اکبر الله اکبر | : گەورەترە |
| اشهد ان لاالەالاالله | : شایەتی دەدەم کەهیچ پەرستراوێکی |
| اشهد ان لاالەالاالله | : راستەقینە نییە تەنها (الله) نەبێت. |
| اشهد ان محمداً رسول الله | : شایەتی دەدەم کە (محمد) |
| اشهد ان محمداً رسول الله | : پێغەمبەری خوایە |
| حي على الصلاة | : وەرن بۆ نوێژ |
| حي على الصلاة | : کردن |
| حي على الفلاح | : وەرن بۆ کاری•کە |
| حي على الفلاح | : مایەی سەرکەوتنە |
| الله اکبر الله اکبر | : خوا لەهەموو شتێ گەورەترە |
| لاالەالاالله | : هیچ پەرستراوێکی راستەقینە نییە جگە لە (الله) |

تێبینی : لە نوێژی بەیانیدا لەدوای (حي على الفلاح) سوننەتە دوو جار بوترێ «الصلاة خير من النوم» واتە : نوێژ لەخەوتن باشترە.

## وانەی چوارەم:

پرسیار.١ : چۆن قامەت دەکرێت بۆ هەستان بۆ نوێژ کردن؟
وەڵام: بەم شێوەیەی خوارەوە قامەت دەکرێت:
الله اکبر الله اکبر
اشهد ان لاالەالاالله
اشهد ان محمداً رسول الله
حي على الصلاة
حي على الفلاح
قد قامت الصلاة : بێ گومان کاتی نوێژ کردن هاتووە..
قد قامت الصلاة
الله اکبر الله اکبر
لاالەالاالله

## (وانەی پێنجەم):

**پرسیار-١ : ژمارەی نوێژە فەرزەکان لە شەوو ڕۆژێکدا چەندن وەکامانەن ؟**

وەلام: لە شەوو ڕۆژێکدا پێنج نوێژ پێویست کراوە لەسەرمان کە بریتین لەمانەی خوارەوە:

١) نوێژی بەیانی ــ (٢) ڕکعاتە.
٢) نوێژی نیوەڕۆ ــ (٤) ڕکعاتە.
٣) نوێژی عەسر ــ (٤) ڕکعاتە.
٤) نوێژی شێوان «مەغریب» ــ (٣) ڕکعاتە.
٥) نوێژی خەوتنان «عشاء» ــ (٤) ڕکعاتە.

**پرسیار-٢ : مەرجەکانی دروستی نوێژ چین ؟**

وەلام: ١) هاتنی کاتی نوێژ.
٢) پاکی لە لەش پیسیو بێ دەست نوێژی (الحدث الاصغر والاکبر).
٣) پاکو خاوێنی لاشەو جلو بەرگو شوێنی نوێژ کردن.
٤) خۆ داپۆشین.
٥) ڕوو کردنە ڕووگە (قیبلە).

## (وانەی شەشەم):

**پرسیار-١ : پایەکانی نوێژ کامانەن (ارکان الصلاة) ؟**

وەلام: ١) نیەت هێنان بەدڵ.
٢) وەستان بەپێوە لەنوێژی فەرزدا بۆ کەسێ بتوانێت.
٣) وتنی (الله اکبر)ی دابەستنی نوێژ.
٤) خوێندنی سورەتی (فاتحة) لە هەموو ڕکعاتەکانی نوێژدا فەرز بێت یان سوننەت.
٥) چەمانەوە(ڕکوع).
٦) هەستانەوە لە ڕکوعو ڕێك وەستان.
٧) کڕنووش (السجدة)بردنی یەکەم.
٨) دانیشتن لەنێوان کڕنوشەکاندا (السجدتان).
٩) کڕنووشی (السجدة) بردنی دووەم.
١٠) دانیشتنی کۆتایی.
١١) خوێندنی (تحیات)ی کۆتایی.
١٢) صلوات دان لەسەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە (تحیات)ی کۆتاییدا.
١٣) دلنیابوون (الطمأنیة) لە هەموو ئەم پایانەی سەرەوەدا.
١٤) سەلامدانەوەی یەکەم.

---

سەرچاوەکانی بەشی خواپەرستی:


١- فقه السنة ــ سید سابق.
٢- فقه المیسر ــ احمد عیسی عاشور.
٣- خوا پەرستی لە ئیسلامدا ــ احمد کاکە محمود.
٤- شەریعەتی ئیسلام ــ مامۆستا عبدالکریم مدرس.
٥- نوێژو پێویستییەکانی ــ عبدالرحمن طه.

# د ـ بەشی خوورەوشتو ئادابی ئیسلامی:

خورەوشت سەرچاوەو بناغەی هەموو کۆمەڵگایەکە بۆیە پێویستە قوتابیان هەر لە ئێستاوە رابهێنرێن بەو خورەوشتە ئیسلامی‌یانەی کە دەبنە هۆی دروست کردنی نەوەیەکی نوێو پیاوی دوا رۆژ چونکە هەر کۆمەڵگایەك دابمەزرێت لەسەر بنچینەی خورەوشتی بەرزو پیرۆز هەمیشە جێگای ئومێدو پشت پێ بەستنە . هەر بۆیە خوای گەورەش وەصفی پێغەمبەر دەکات بەخورەوشتی بەرز «وانك لعلى خلق عظيم» القلم-٤. وەهەروەها پێغەمبەری خواش ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت ( انما بعثت لاتمم مكارم الاخلاق ) صحيح رواه احمد .

## وانەی یەکەم:

### ـ ئەدەبمان لەگەڵ دایكو باوكدا:

پێویستە لەسەرمان کە هەمیشە هەڵسو کەوتمان لەگەڵ دایكو باوکماندا بەم شێوەیەی خوارەوە بێت .

١- هەمیشە رێزیان لێ بگرینو کاتێ لە شوێنێك هاتنەوە بەپیریانەوە بچینو بەخێر هاتنەوەیان بکەین .
٢- هەمیشە نەرمو نیان بین لەگەڵیانداو هەرگیز قسەی رەقو ناشیرین لەروویاندا نەکەینو دڵیان ئازار نەدەینو دەنگیان بەسەردا بەرز نەکەینەوە .
٣- هەموو بەیانی‌یەك کەلەخەو هەستاین یان کەگەراینەوە بۆ ماڵەوە سەلامیان لێ بکەینو بڵێین ( السلام عليكم ورحمة الله ) .
٤- لە ئیشو کاری ماڵەوەدا یارمەتی‌یان بدەینو زەحمەتیان نەدەین .
٥- کاتێ ئامۆژگاری‌یان کردین بەگوێیان دەکەین .
٦- کاتێ لەماڵ دەرچووین مۆڵەتیان لێ وەردەگرین .
٧- هەرگیز درۆیان لەگەڵدا ناکەین .
٨- لەکاتی پشوو خەویاندا بێ دەنگو بەئارام دەبین .
٩- رێزی هاورێیانی دایكو باوکمان دەگرینو کاتێ پێیان گەیشتین سەلامیان لێ دەکەین .
١٠- لەکاتی نان خواردندا پێشیان ناکەوینو لەسەرووی ئەوانیشەوە دانانیشین .
١١- بیانویان لێ ناگرینو هەرچی‌یان پێداین رازی دەبین .
١٢- بەبەردەوام دوعای خێریان بۆ دەکەینو داوای گەردن ئازادی‌یان لێ دەکەین .

## وانەی دووەم:

### ـ ئەدەبمان لەگەڵ مامۆستادا:

پێویستە قوتابی بۆ مامۆستاکە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکات:

١- گوێ رایەڵی مامۆستا بکەینو لەقسەی دەرنەچین.
٢- کە بانگی کردین بە (بەڵێ) وەڵام بدەینەوەو بەدەمیەوە بچین.
٣- درۆ نەکەین لەگەڵ مامۆستاداو هەمیشە راستگۆبین..
٤- سەیری مامۆستا بکەینو گوێ بگرین لە وتەکانیو سەرنجیان بدەین.
٥- ئەو ئەرکانەی کە پێمان دەسپێرێت بەخێرایی جێ بەجێیان بکەین.
٦- لەکاتی دەرسدا بەبێ مۆڵەتی مامۆستا ناچینە دەرەوە.
٧- هەوڵ بدەین لەوانەکان دوانەکەوین وەکاتێ دواش کەوتین داوای مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی لێ بکەین.
٨- پێویستە رێزی مامۆستا وەك دایكو باوك بگرینو هیچ کات دەنگمان بەسەریدا بەرز نەکەینەوە.

## وانەی سێیەم:

### ـ ئەدەبمان لەگەڵ هاورێکانماندا:

١- کاتی پێیان گەیشتین بەروی خۆشەوە سەلامیان لێ دەکەینو رێزیان لێ دەگرین.
٢- بەخۆشترین ناویان بانگیان دەکەین، وەك بەکارهێنانی وشەی (کاك).
٣- ناوو ناتۆرەو ئانەو تەشەریان لێ نادەین.
٤- وەك برای خۆمان سەیریان دەکەینو ناتەواویەکانیان دەشارینەوەو باسیان ناکەین.
٥- لەکاتی وانەدا قسەیان لەگەڵدا ناکەینو سەریان لێ تێك نادەین.
٦- هەر کاتێ نەخۆش کەوتن سەردانیان دەکەینو دوعای چاك بوونەوەیان لەخوای گەورە بۆ دەخوازین.
٧- رێزی باوكو دایکیان دەگرینو سەلامیا ن لێ دەکەین کاتێ پێیان گەیشتین.
٨- لەپاش ملە هەرگیز بەخراپە ناویان نابەینو غەیبەتیان ناکەین.

٩- هەرچیمان بۆ خۆ پێخۆش بوو بۆ ئەوانیش پێمان خۆش بێت.
١٠- کاتێ چاکەیان لەگەڵ کردین سوپاسیان بکەین.

## وانەی چوارەم:

## ـ ئادابی نان خواردن:

١. پێش نان خواردن دەستو پلمان جوان دەشۆین.
٢. چاوەڕوان دەکەین تا لەخۆمان گەورەتر دەست پێ دەکات.
٣. پێش دەست پێ کردن (بسم الله) دەکەین وەئەگەر لەسەرەتاوە لەبیرمان چوو لەناوەڕاستدا دەڵێین (بسم الله اوله وآخره).
٤. بەدەستی راستمان خواردن دەخۆین.
٥. لەبەردەمی خۆمانەوەو بەسێ پەنجە دەخۆین.
٦. پارووەبچوك دەگرینو بەچاکی دەیجووینو پاشان قووتی دەدەین.
٧. لۆمەی هیچ خواردنێك ناکەین چی دانرا پێی رازی دەبینو زیاد لە پێویستیش ناخۆین.
٨. بەدانیشتنەوە نان دەخۆینو بەپێوە یان بە راکشانەوە باش نییە.
٩. خواردن خەسار ناکەین ئەگەر پاروو لە دەستمان کەوتە خوارەوە هەڵی دەگرینەوەو دەیسرینو پاشان دەیخۆینو سینگو بەرۆکیشمان پیس ناکەین.
١٠. ئەگەر میوانمان لەگەڵ بوودەست هەڵناگرین تا ئەوان تێر بخۆنو شەرم نەکەن.
١١. کەلێ بووینەوە سوپاسی خوا دەکەینو دەڵێین (الحمدلله)و دەستو دەممان دەشۆین.

## وانەی پێنجەم:

## ـ ئەدەبمان لەگەڵ مزگەوتدا:

١. هەر کاتێك گوێمان لەبانگ بوو بەزووییو بەهێمنی بەرەو مزگەوت دەڕۆین.
٢. پێش ئەوەی بچینە ناو مزگەوت دەست نوێژ دەگرینو بەپاكو خاوێنییەوە دەچینە ژوورەوە.
٣. کە دەچینە ژوورەوە پێی راستمان پێش دەخەینو سەلام دەکەینو دەڵێین: (اللهم افتح لي ابواب رحمتك).
٤. ئەگەر چوینە ژوورەوە دوو رکعات نوێژی سوونەتی مزگەوت (تحية المسجد) دەکەین.
٥. دوای چوونە ژوورەوە بە ئارامی دادەنیشینو چاوەڕێی نوێژ یان وانە دەکەین کە بانگ درا بێ دەنگ دەبینو لەبەر خۆمانەوە دووبارەی دەکەینەوە.
٦. لەکاتی نوێژدا لەگەڵ هاوڕێکانماندا لەدوای پیاوانەوە ریز دەبەستین، بەڕێکیو ناچینە ریزەکانی پێشەوەوبەهێمنی نوێژ دەکەینو دەنگ بەرز ناکەینەوەو پێ ناکەنینو زۆر جەو جوڵ ناکەین.
٧. پاش سەلام دانەوە لەنوێژ بێ دەنگ دەبینو سەر لەخەڵکی تێك نادەینو بەبەردەمی نوێژی کەسدا تێ ناپەڕین..

٨. لەناو مزگەوتدا هەرگیز شت ناخۆینو تف ناکەین لەناو مزگەوتدا .
٩. ئەگەر مزگەوت پێویستی بەپاك کردنەوە هەبوو پاکی دەکەینەوەو خۆشمان هەرگیز پیسو پۆخڵی ناکەین .
١٠. کاتێ لەمزگەوت دەرچووین پێی چەپمان پێش دەخەینو دەڵێین (اللهم اني اسألك من فضلك ) .
١١. لە دەرەوەی مزگەوتیشدا هەرگیز کاری خراپ ناکەینو هەمیشە دڵمان دەبەستینەوە بەمزگەوتەوە وهەوڵ دەدەین ببینە نموونەی قوتابی راستەقینەی قورئان .
١٢. چاوەڕێی نوێژی داهاتوو یان وانەی داهاتوو دەکەینو خۆمانی بۆ ئامادە دەکەین .

## وانەی شەشەم:

# ـ هەندێك ئادابی ئیسلامی گشتی:

پرسیار.١ : ئەگەر رۆیشتیت بۆ هەرماڵێك پێش چوونە ژوورەوە پێویستە چی بکەیت ؟
وەڵام: لەدەرگا دەدەمو داوای مۆڵەت دەکەم.
پرسیار.٢ : هەر کاتێك ناوی پێغەمبەری خوات بیست چی دەڵێت
وەڵام: دەڵێم (صلی الله علیه وسلم).
پرسیار.٣ : دەست پێکردنی هەموو کارێکی چاکت دەبێ بەچی بێت ؟
وەڵام: دەست پێ دەکەم بەناوی خواو دەڵێم (بسم الله).
پرسیار.٤ : لەکاتی بیستنی قورئاندا چی پێویستە ؟
وەڵام: بێ دەنگ دەبمو گوێی بۆ دەگرم.
پرسیار.٥ : دەبێت لەگەڵ گیانلەبەراندا چۆن بین ؟
وەڵام: دڵ نەرمو بەبەزەیی دەبینو ئازاریان نادەین.
پرسیار.٦ : کاتێ میوانمان هات چی دەکەین ؟
وەڵام: رێزی دەگرینو بەخێرهاتنی گەرمی دەکەین.
پرسیار.٧ : کێ خوشكو برای راستەقینەمانە ؟
وەڵام: تەنها باوەڕداران خوشكو برامانن.

---


<u>سەرچاوەکانی بەشی خورەوشتو ئادابی ئیسلامی:</u>
١) منهاج المسلم ـ ابوبکر الجزائري.
٢) منهاج القاصدين ـ ابن قدامة المقدسي.
٣) أدب المسلم ـ محمد سعيد مبيض.
٤) نداء الى المربين والمربيات لتوجيه البنين والبنات ـ محمد بن جميل زينو.

# هـ ـ بەشی چیرۆكو بەسەرهات:

قال تعالى: «لقد كان في قصصهم عبرة لاولي الالباب» يوسف(١١١)

(وانەی یەكەم):

# چیرۆكو بەسەرهاتی ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ):

## ١ـ كێ بتەكانی شكاند؟

لەرۆژانی كۆنو نوێدا ، لەگوندێكدا پیاوێكی بەناوبانگ هەبوو ، ئەو پیاوە ناوی (ئازەر) بوو ، ئازەر بت فرۆش بوو لەو گوندەدا خانوویەكی گەورە هەبوو ، لەو خانووەدا بت هەبوو ، بتی زۆری تێدا بوو ، خەڵكی كرنوشیان بۆ دەبرد ، ئازەریش ئەو بتانەی دەپەرست .

ئازەر كوڕێكی زۆر ژیری هەبوو ، ئەو كوڕە ناوی ئیبراهیم بوو ، ئیبراهیم سەیری دەكرد ئەو خەڵكە كرنووش بۆ ئەو بتانە دەبەنو ئەو بتانە دەپەرستن .

ئیبراهیم دەیزانی ئەو بتانە بەردن ، وە دەیزانی ئەو بتانە نەقسە دەكەنو نەدەبیستن ، وەدەیزانی ئەو بتانە نەزیانیان هەیەو نەكەڵك .. وەدەیزانی كە مێشو مەگەز دەنیشێتەوە بەسەر ئەو بتانەوەو ناتوان دەری بكەن .. ئیبراهیم لەبەر خۆیەوە دەیووت : (بۆچی خەڵكی كرنووش بۆ ئەو بتانە دەبەن؟ بۆچی خەڵكی لەو بتانە دەپاڕێنەوە؟

## ٢ـ ئامۆژگاری ئیبراهیم:

ئیبراهیم بەباوكی وت : بابە گیان بۆچی ئەو بتانە دەپەرستن؟ بۆچی كرنووش بۆ ئەو بتانە دەبەن؟ بۆچی لەو بتانە دەپاڕێنەوە؟ ئەو بتانە نەقسە دەكەنو نەدەبیستن؟ ئەو بتانە نەدەتوانن كەڵك بەكەس بگەیەنن ، نەزیان!

بۆچی خواردنو خواردنەوەیان بۆ دادەنێن؟ بابە گیان : ئەو بتانە نەدەخۆنو نەدەخۆنەوە ، باوكی ئیبراهیم تێ نەدەگەیشتو تووڕە دەبوو ، ئیبراهیم ئامۆژگاری هەموو خەڵكەكەی دەكرد .. بەلام خەڵكی تێ نەدەگەیشتنو تووڕە دەبوون ، ئیبراهیم لەدڵی خۆیدا وتی : من ئەو بتانە دەشكێنم .. ئینجا خەڵكی تێدەگەن .

## ٣- ئیبراهیم بتەکان دەشکێنێت:

ڕۆژی جەژن هات، خەڵکی هەموو دڵخۆش بوون، خەڵکی هەموو چوونە دەرەوە بۆ جەژن گێڕان، باوکی ئیبراهیم چووە دەرەوەو بەئیبراهیمی وت: وەرە دەرەوە لەگەڵماندا، ئیبراهیم وتی: من نەخۆشم نایەمە دەرەوە! خەڵکی هەموو ڕۆیشتن، بەڵام ئیبراهیم مایەوە، ئیبراهیم هات بۆ ناو بتەکان وەلەبتەکانی پرسی!

ئایا قسە ناکەن؟ ئایا نابیستن؟ ئایا ناخۆن! ئەوە خواردنو خواردنەوەیە... بتەکان قسەیان نەدەکرد، چونکە بەردن، بەرد قسە ناکات، ئیبراهیم وتی: چیتانە بۆ قسە ناکەن؟ بتەکان هەر قسەیان نەدەکرد، ئیبراهیم تووڕە بوو تەورەکەی هەڵگرت.. دەستی کرد بەشکاندنی بتەکان، ئیبراهیم بتە گەورەکەی نەشکاند، هێشتییەوە، تەورەکەی خستە سەر شانی بتە گەورەکە،

## ٤- کێ بتەکانی شکاندووە؟

کاتێ خەڵکی هاتنەوەو چوونەماڵی بتەکانو ویستیان کڕنووش بەرن بۆیان، چونکە ئەو ڕۆژە ڕۆژی جەژن بوو، بەڵام دیتیان بتەکانیان شکاندووە، سەریان سووڕماو تووڕە بوون، وتیان کێ وای کردووە لەخواکانمان؟ وتیان ئەوەی باسی بتەکانی دەکرد منداڵێ بوو، ناوی ئیبراهیم بوو، لە ئیبراهیمیان پرسی ئایا تۆ وات کردووە لەخواکانمان ئەی ئیبراهیم؟

ئیبراهیم وتی: بتە گەورەکەیان وای کردووەو هەموو بتەکانی تری شکاندووە، لێی بپرسن ئەگەر قسە دەکات، خەڵکی دەیانزانی بتە گەورەکەش بەردەو قسە ناکات، وەلەجێی خۆشی ناجوڵێت، بە ئیبراهیمیان وت خۆت دەزانی بتەکان قسە ناکەن، ئیبراهیم وتی ئەی بۆچی دەیانپەرستن، ئەگەر نەکەڵکیان هەیەو نەزیان، چۆن لەبت

دەپاڕێنەوە نەگوێی لێیەو نەقسە دەکات ئایا تێ ناگەن؟ ئایا ژیر نابن؟ خەڵکەکە هەموو بێ دەنگ بوونو تەریق بوونەوە!

## ٥- ئاگری سارد

خەڵکی کۆبوونەوە، وتیان چی بکەین؟ ئیبراهیم بتەکانی شکاندووە، خواکانی ڕیسوا کردووین! خەڵکی پرسیاریان کرد، چی بکەین لەئیبراهیم؟ وتیان بی سووتێنن‌و هەقی خواکانتان بسێنن، ئاگرێکی گەورەیان کردەوەو ئیبراهیمیان خستە ناوی، بەڵام خوای میهرەبان ئیبراهیمی سەرکەوتوو کرد، وە بەئاگرەکەی وت! «یانار كوني بردا وسلاما على ابراهيم» ئەی ئاگر ساردبەو ئەزیەتی ئیبراهیم نەدەی.

بەو شێوەیە ئاگرەکە سارد بوو، وەئیبراهیمی نەسووتاند، خەڵکەکە کەزانییان ئاگرەکە ئیبراهیم ناسوتێنێ، زۆر سەریان سووڕما لەوەی ئیبراهیم ناسووتێ‌و دڵخۆشە.

## ٦- کێ خوایە؟

شەوێکیان ئیبراهیم ئەستێرەیەکی دی، وتی ئەوە خوای منە، بەڵام کەرۆژ بوویەوەو ئەستێرەکە ون بوو، ئیبراهیم وتی! نەء ئەوە خوای من نییە، کاتێ ئیبراهیم مانگە شەوی دی وتی! ئەوە خوای منە، کاتێ کەمانگ ئاوا بوو وتی! نەء ئەوەش خوای من نییە، کاتێك خۆر هەڵهات وتی! ئەوە خوای منە لەهەموویان گەورەترە، کاتێك خۆر ئاوا بوو ئیبراهیم وتی: نەء ئەوەش خوای من نییە.

ئینجا وتی: خوای من خوایەکە هەمیشە زیندووەو قەت نامرێت، خوا هەر دەمێنێتو ئاوا نابێت (ون نابێت)، خوا گەورەیەو بەهێزە هیچ شتێ پێی ناوێرێت، ئەستێرەکان وازوو رووناکی بەیانیان ونیان دەکات، مانگەشەو لاوازەو خۆرەتاو پێی دەوێرێت، هەوریش دەتوانێ بەری بگرێت، ئەستێرکان ناتوانن سەرکەوتووم بکەن، چونکە بێ هێزن، مانگە شەو سەرکەوتووم ناکات، چونکە بێ هێزە، تەنها خوا سەرکەوتووم دەکات، خوا زیندووەو هەرگیز نامرێت، خوا بەهێزەو هیچ شتێك پێی ناوێرێت..

## ٧- خوای من «الله»یە

ئیبراهیم بۆی دەرکەوت کەپەروەردگار «الله» خوای ئەوە، چونکە تەنها خوا نامرێتو هەمیشە زیندوە، ئیبراهیم زانی کەخوا، خوای ئەستێرەکانیشەو خوای مانگە شەوەو خوای خۆریشە، خوای هەموو جیهانیانە، خوای گەورە ڕێگای پیشان ئیبراهیمداو کردی بەپێغەمبەر، خوای گەورە فەرمانی کرد بەئیبراهیم، گەلەکە ئاگادار بکات، کەخوا بپەرستن، وەبتەکان نەپەرستن.

## ٨- داواکاری ئیبراهیم:

ئیبراهیم داوای کرد لەگەلەکەی کەبت نەپەرستن، بەڵکو خوا بپەرستن، ئیبراهیم پرسی لەخەڵکەکە! چی دەپەرستن؟ وتیان: بتەکانمان دەپەرستین، ئیبراهیم وتی ئەگەر قسەیان لەگەڵ بکەن گوێیان لێیە؟ وەیان کەڵکتان پێ دەگەیەنن، خەڵکەکە وتیان: باوو باپیرانمان بتیان پەرستووە، ئیبراهیم وتی: من ئەو بتانە ناپەرستم، من دوژمنی ئەو بتانەم، من خوای گەورە دەپەرستم، ئەو خوایە دەپەرستم کە دروستی کردووم، ئەو خوایەی ئەگەر نەخۆش کەوتم چاکم دەکاتەوە، ئەو خوایەی دەم مرێنێو جارێکی تر زیندووم دەکاتەوە، ئەو بتانە ناپەرستم چونکە ناتوانن کەس دروست بکەن، ناتوانن رزقی کەس بدەن، ناتوانن خواردنو خواردنەوە بدەن بەکەس، ئەگەر یەکێ نەخۆش کەوت، بتەکان ناتوانن چاکی بکەنەوە، ئەو بتانە ناتوانن کەس بمرێننو کەس زیندوو بکەنەوە.

## ٩- بەرامبەر پاشا (نەمرود):

لەو شارەدا پاشایەکی گەورە هەبوو ناوی (نەمرود) بوو، ئەو پاشایە زۆر ستەمکار بوو، خەڵکی کڕنووشیان بۆ دەبرد، پاشا بیستی کە ئیبراهیم کڕنووش تەنها بۆ خوا دەبات، ئیتر کڕنووش بۆ کەسی تر نابات، زۆری پێ ناخۆش بوو، داوای کرد

ئیبراهیم بێت بۆ لای .
ئیبراهیم هات بۆ لای ، ئیبراهیم لەکەس نەدەترسا لەخوا نەبێت ، پاشا لە ئیبراهیمی پرسی ! کێ خوای تۆیە ؟ ئیبراهیم وتی : خوای من «الله»یە ، پاشا وتی : «الله» کێیە ئەی ئیبراهیم ؟ ئیبراهیم وتی : «الله» ئەو خوایەیە کەخەڵکی دەمرێنێو زیندووشی دەکاتەوە ، پاشا وتی من زیندو دەکەمەوەو دەشمرێنم ، پاشا بانگی زەلامێکی کردو کوشتی ، وەبانگی زەلامێکی تری کردو نەیکوشتو بەرەڵای کرد ، پاشا وتی : من ئەو پیاوەم نەکوشت ئەوە زیندووم کردەوە ، پیاوەکەی ترم کوشت ئەوە مراندم ، پاشا زۆر گەوج بوو ، وەکو هەموو خوا نەناسێك ، ئینجا ئیبراهیم وتی : خوای من خۆر لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدێنێ ، ئەگەر تۆ دەتوانی لە خۆرئاواوە هەڵی بێنە ، پاشا زۆر سەرسام بوو وەبێ دەنگ بوو ، پاشا تەریق بوویەوەو نەشیتوانی وەڵام بداتەوە .

## ١٠- ئیبراهیم بانگی باوکی دەکات:

ئیبراهیم بانگی باوکی کرد بۆ خواپەرستی وتی : بابە گیان ! بۆچی شتێ دەپەرستی نەکەڵکی هەیەو نەزیان ، بۆچی کەسێك ناپەرستی کەدەتوانێ کەڵك بگەیەنێ بەخەڵکیو دەشتوانێ زیان بدات لەخەڵکی ، بابە گیان شەیتان مەپەرستە ، باوکی لێی توورە بوو وتی : لاچۆ لەلام قسە مەکە ، ئیبراهیم زۆر بێتاقەت بوو ، سەلامی لە باوکی کردو رۆیشت ، ئیبراهیم ویستی ئەو شارە بەجێ بهێڵێتو بچێت بۆ شارێکی تر کە لەوێ خوا بپەرستێتو خەڵك بانگ بکات بۆ خواپەرستی .

## ١١- چونی بو مەککە:

خەڵکی هەموو لە ئیبراهیم توورە بوون ، ئیبراهیم ویستی ئەو شارە بەجێ بهێڵێتو بچێت بۆ شارێکی تر ، ئیبراهیم خواحافیزی لە باوکی کردو رۆیشت ، ئیبراهیم کەوتەرێ بەرەو مەککە ، هاجەری ژنیو ئیسماعیلی کوڕی لەگەڵدا بوو ، شاری مەککە شارێکی وشكو بێ ئاو بوو ، نەگیاو نەدرەختی تێدا نەبوو ، ئیبراهیم کاتێك گەیشتە جێگای مەککە ، جێگایەکی چۆڵ بوو کەسی تێدا نەبوو ، ئیبراهیمو هاجەرو ئیسماعیل لەو چۆڵەدا دانیشتن ، ئیبراهیم ویستی ژنەکەیو ئیسماعیل بەجێ بهێڵێتو بروات بەلایەکدا ، ژنەکەی لێی پرسی ئەی ئیبراهیم بۆ کوێ دەچیت ؟ چۆن لەم جێگا چۆڵە بێ ئاوەدا ئێمە بەجێ دێڵیت ؟ ئایا لەسەر فەرمانی خوای گەورە دەڕۆیت ؟
ئیبراهیم وتی : بەڵێ خوای گەورە فەرمانی پێ کردووم ، هاجەر وتی : ئەگەر لەسەر فەرمانی خوا بێت قەیناکات بڕۆ ، ئێمەش لێرە خوای گەورە خۆی دەمانپارێزێت .

## ١٢- بیری زەم زەم:

ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم تینووی بوو ، داوای ئاوی لە دایکی کرد . . . بەڵام ئاو نییە . . . لە مەککە نەرووبار هەیەو نەبیری ئاو . . دایکی ئیسماعیل کەوتە گەڕان لە سەفاوە بۆ مەروا ، دووبارە لە مەرواوە گەڕایەوە بۆ سەفا .
ئینجا خوای گەورە بەزەیی هاتەوە بەوانداو ئاوی لەزەوی بۆ هێنانە دەرەوە

ئیسماعیل ئاوی خواردەو ... هاجەری دایکیشی ئاوی خواردەوە ، ئاوەکەش مایەوەوبوو بەبیری زەم زەم ، خوای گەورە بەرەکەتی خستە بیری زەم زەم ، تا ئێستاش هەر ماوەو حاجیەکان ئاوی لێ دەخۆنەوەو ئاویشی لێ دەهێننەوە بۆ وڵاتانی خۆیان ..

## ١٣ـ خەونی ئیبراهیم:

پاش ماوەیەك ئیبراهیم گەڕایەوە بۆ مەککە ، کاتێ گەیشتەوە مەککە چاوی بەهاجەرو ئسماعیل کەوت زۆر دڵخۆش بوو ، ئیسماعیلی کوڕی زۆر دڵخۆش بوو بە بینینی باوکی ، ئیبراهیم ئیسماعیلی زۆر خۆش دەویست ، شەوێك ئیبراهیم خەونی دی ، لە خەونیا دی کەوا ئیسماعیلی کوڕی سەر دەبڕێت ، ئیبراهیم پێغەمبەری خوا بوو ، راستی دەکرد ، خەونەکەی راست بوو .. ئیبراهیم ویستی بەفەرمانی خوای گەورە بکات ، کە لە خەودا پێی وتراوە کوڕەکەت سەربڕە ، ئیبراهیم بە ئیسماعیلی کوڕی وت : کوڕەکەم من لە خەومدا تۆم سەر بڕیووە ، دەڵێی چی ؟ ئیسماعیل وتی : بابە گیان ئەوەی فەرمانت پێ کراوە بیکە ، بە پشتیوانی خوا من ئارام دەگرم ..

ئیبراهیم چەقۆیەکی هەڵگرتو ئیسماعیلی دایە پێش خۆیو رۆیشتن کاتێ گەیشتە ( مینا ) ویستی لەوێ سەری ببڕێت ، ئیسماعیل ئەژنۆی نایە سەر زەویو ملی کەچ کرد ئیبراهیم چەقۆی نایە سەر ملیو ویستی سەری ببڕێت ، خوای گەورە لێرەدا خۆشەویستی خۆی تاقی کردەوە ویستی بزانێ : بەقسەی دەکات .

ویستی بزانێ ئیبراهیم خوای زۆرتر خۆش دەوێت یان کوڕەکەی ، ئیبراهیم لەو تاقی کردنەوەیەدا سەرکەوت ، خوای گەورە بە جوبرەیلدا لە بەهەشتەوە مەڕێکی بۆ نارد ، وە بەئیبراهیمی وت : ئەم مەڕە سەر بڕەو ئیسماعیل سەر مەبڕە ، سڵاوو درودی خوا لەسەر ئیبراهیمو ئیسماعیل ..

## ١٤ـ کەعبە:

کاتێ ئیبراهیم گەڕایەوە ویستی لەو جێگایەدا خانویەك بکاتەوە ، بیکات بەماڵی خوا ، ئیبراهیمو ئیسماعیل کەوتنە بەرد کۆکردنەوە بۆ دروست کردنی ئەو خانووە بەهەردووکیان کەعبەیان دروست کرد ، وەهەردووکیان لەخوا دەپاڕانەوەو دەیانوت : خوای گەورە لێمان وەربگرە هەر تۆ زاناو بیسای ( دەبیستی ) ، خوای گەورە ئەو کارە پیرۆزەی لێ وەرگرتن ، ئێستا موسڵمانان هەموو دەچن بۆ کەعبە بۆ حەج وەهەمووشیان لەنوێژدا روو دەکەنە کەعبە .

## ١٥ـ بەیتول موقەدەس (البیت المقدس):

ئیبراهیم ژنێکی تری هەبوو ناوی ( سارە ) بوو ، ئیبراهیم لە سارە کوڕێکی تری هەبوو ناوی ئیسحاق بو ، ئیبراهیم لەگەڵ ئیسحاق لەشام دادەنیشت ، ئیسحاق لەشام ماڵێکی کردەوە بۆ خوای گەورە ، ئەو ماڵە ناوی مزگەوتی ( بیت المقدس ) بوو .

لەدوایی‌دا ئیسحاق کوڕێکی بوو ناوی ( یەعقوب ) بوو ، یەعقوبیش پێغەمبەر بوو ، یەعقوب دوانزە کوڕی هەبوو ، یوسف یەکێ بوو لەو دوانزە کوڕەی ( یەعقوب ) ، یوسف چیرۆکێکی زۆر سەیری هەیە داوا لە مامۆستا بکە بۆت بگێڕێتەوە ..

وانەی دووەم:

# چیرۆکەو بەسەرهاتی نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت)

## کەشتی نوح

### ١ـ دوای ئادەم:

خوای گەورە نەوەی ئادەمی زۆر کرد ، بڵاوەیان کرد بەناوچەکاندا ، ئەگەر ئادەم بهاتایەو ئەم هەموو نەوەی خۆی بدیایە یا نەیدەناسینەوە وەئەگەر پێیان بووتایە ئەمانە هەموویان نەوەی تۆن ، سەری سوڕ دەما وەدەیووت : ( سبحان الله ) ئائەمانە هەموو نەوەی منن . . . ؟ !

نەوەی ئادەم دێهاتی زۆریان دروست کرد ،ماڵی زۆریان کردەوە ، زەویان دەکێڵاو کشتوکاڵیان دەکردو پێی دەژیان ، خەڵکی لەسەر ئایینی باوکە ئادەمیان بوون ، خوایان دەپەرست ، هاوبەشیان بۆ پەیدا نەدەکرد ! خەڵکی هەموو وەك یەك نەتەوە بوون ، باوکیان ئادەم بوو خوایان ( الله ) بوو . .

### ٢ـ کێشەی شەیتان:

بەڵام ئایا شەیتانو نەوەکانی چۆن حەز دەکەن نەوەی ئادەم بەم شێوەیە زۆر ببن ؟ ئایا چۆن تا ئێستاش خەڵکی هەر خوا دەپەرستن ؟ ئایا چۆن نەوەی ئادەم بچنە بەهەشتو شەیتانو نەوەی شەیتان بچنە دۆزەخ . ئایا چۆن دەبێ خەڵکی هەریەك نەتەوەبنو ناکۆکی نەبێ لە نێوانیاندا !

نابێ ئەمە وا بێت . . نابێ ئەمە وابێت . . ! لەبەر ئەوەی شەیتان کڕنووشی نەبرد بۆ ئادەم ، خوا لەبەهەشت دەری کرد ، ئیتر چۆن تۆڵەی خۆی لە ئادەم نەسێنێ ؟ چۆن کارێك نەکات نەوەی ئادەم لەگەڵیا بچنە دۆزەخ ؟ دەبێ وابکات . . دەبێ وابکات . . . !

### ٣ـ تەکبیری شەیتان:

شەیتان وای بەباش زانی خەڵکی بانگ بکات بۆ بت پەرستی ، بۆ ئەوەی ئەوانیش بچنە دۆزەخو نەچنە بەهەشت . .

شەیتان دەیزانی خوای گەورە لەهەموو گوناهێك خۆش دەبێت ، بەڵام لە هاوەڵ بۆ خوا دانان خۆش نابێت . .

لەبەر ئەوە شەیتان بانگەوازی هاوەڵ بۆ خوا دانانی بڵاو کردەوە ، بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆ بیان بات بۆ دوزەخ ! بەڵام ئایا چی بکات خۆ خەڵکی خوا دەپەرستن ؟ ئەگەر

بەخەڵكی بڵێ وەرن بت بپەرستن، خوا مەپەرستن، خەڵكی دەری دەكەن‌و قسە دەڵێن، وەدەڵێن خوا نەكات، چۆن واز لە خوا پەرستی دەهێنین، تۆ شەیتا ـ تێهەڵدراوو پیسی.

## ٤ـ فێڵی شەیتان:

شەیتان فێڵێكی دۆزی‌یەوە بۆ چوونە ناو مێشكی خەڵكەوە، خەڵكی لەخوا دەترسان، شەوو رۆژ خوا پەرستی‌یان دەكرد، خەڵكی خوایان خۆش دەویست، خواش ئەوانی خۆش دەویست، شەیتان ئەمانەی زانی، زۆر لەو پیاوە لەخوا ترسانە مردن..

ئینجا شەیتان دەهاتە ناو خەڵكەكەو لێی دەپرسین: ئایا فلانە كەس‌و فلانە كەس كە مردوون، كاتی خۆیان چۆن بوون..؟ ئەمانیش دەیانووت: ئەوان پیاو چاكی خوا بوون، وەزۆر خاوەن رێز بوون لای خوای گەورە..

شەیتان وتی: ئێوە ئێستا خەفەتیان زۆر بۆ دەخۆن؟ وەهەمیشە بیریان دەكەن، وانی‌یە...؟!

وتیان: بەڵێ.. شەیتان وتی: ئەی بۆچی هەموو رۆژێ ناچن بۆ ئەوەی بیان بینن..؟

خەڵكەكە وتیان: چۆن بچین بیان بینین...؟ خۆ ئەوان مردون! شەیتان وتی: وێنەیان دروست بكەن‌و هەموو بەیانی‌یەك سەیریان بكەن. خەڵكەكە بەقسەیان كردو وێنەیان دروست كردن‌و هەموو بەیانی‌یەك سەیریان دەكردن..! هەر كاتێك سەیریان دەكردن ئەوانیان بیر دەكەوتەوە..

## ٥ـ لە وێنەوە بو پەیكەر:

بەو شێوەیە لە وێنە دروست كردنەوە گۆڕی‌یان بۆ پەیكەر تاشین، پەیكەری پیاو چاكانیان دروست دەكرد، وەلەماڵەوەو لە مزگەوتەكانیان دایان دەنان. بەڵام ئەوان خوایان دەپەرستو هاوەڵیان بۆ دانەدەنا.

وەدەیانزانی ئەو پەیكەرانەی دروستیان دەكردن پەیكەری پیاو چاكانە، هی خوا نی‌یە، وەدەیانزانی ئەو پەیكەرانە نەقازانجیان هەیەو نەزیان، بەڵام بەشتێكی پیرۆزیان دەزانین.

ئەو پەیكەر تاشین‌و پیروزی لێنانەیان زۆر پەرەی سەند، وەهەر پیاوێكی چاك لەناویاندا بمردایە، پەیكەریان بۆ دروست دەكرد.

## ٦ـ لە پەیكەرەوە بو بت:

كاتێ ئەو بەرە (جیل)ـە تێ پەڕی ئەوەی ئەوان كە دەیاندی باوو باپیریان بەرێزو گەورەی‌یەوە سەیری ئەو بتانە دەكەن، وەدەیاندی ئەو پەیكەرانە ماچ دەكەن، وەدەیاندی لای ئەوان لەخوا دەپاڕانەوە، بەو شێوەیە نەوەی ئەوان زۆر ئەم كارانەی زیاتر كرد..! تاوای لێهات كڕنووشیان بۆ دەبردن..! لەباتی ئەوەی لەخوا بپاڕێنەوە لەبتەكان دەپاڕانەوە، وەقوربانی‌یان بۆ سەر دەبرین.

وەلەبریتی خوای گەورە بتەكانیان دەپەرست، ئەم كارە وردە.. وردە. پەرەی

سەند .. ئەوە مەنات .. ئەوە لاتو نەسر ، ئەوە ود ..!( * ) .

## ٧- خەشمی خوای گەورە:

خوای گەورە تورەیی خۆی باراند بەسەر خەڵکدا ، چۆن خەشمگیر نەبێت ...؟! ئایا بۆ ئەوکارانەی دروست کردوون ؟ ئەوە ستەمێکی گەورەیە ...! خوای گەورە خەشمی خۆی دەربری‌و بارانی لێ گرتنەوە .. بەروبوومی کشتوکاڵ نەما ، هەتا نەوەی ئەوانیش کەم بوویەوە ، بەڵام خەڵکی ژیر نەبوون ، تۆبەیان نەکرد ، پەشیمان نەبوونەوە .

## ٨- پەیامبەر

خوای گەورە ویستی یەکێ لەخۆیان بنێرێت بۆ لایان ، قسەیان لەگەڵدا بکات‌و ئامۆژگاری‌یان بکات ، خوای گەورە ناچێت خۆی یەکە .. یەکە .. قسە لەگەڵ ئەو خەڵکە بکات ، لەبەر ئەوە یەکێکی بۆ دەناردن کە ئامۆژگاری‌یان بکات ، خوای گەورە ویستی ئەو پەیامبەرە ئادەمیزاد بێت ، بۆ ئەوەی پێیان بڵێت وەرن .. ئەو خوای گەورەیە بپەرستن ، وەبێجگە لەو کەسی تر مەپەرستن ..

## ٩- ئادەمیزاد یا فریشتە؟:

خوای گەورە ویستی ، ئەو نێرراوە ئادەمیزاد بێت ، یەکێك لە خۆیان بێت ، خەڵکی بیناسن لە قسەکانی تێبگەن ، چونکە ئەگەر پەیامبەرەکە فریشتە بوایە ، خەڵك دەیانووت : ئێمە چیمانە بەسەریەوە ، ئەو فریشتەو ئێمە ئادەمیزاد ..!
ئێمە ئەخۆینو ئەخۆینەوە ، ماڵو مناڵمان هەیە ، چۆن خوا بپەرستین ؟ ئینجا ئەگەر پەیامبەرەکە ئادەمیزاد بێت ، دەڵێت خۆ منیش دەخۆمو دەخۆمەوەو ماڵو مناڵیشم هەیەو خوایش دەپەرستم ، ئیتر ئێوە بۆ نایپەرستن ..؟
ئەگەر فریشتە بوایە ، خەڵکی دەیانووت : تۆ نەبرسیتو نەتینووت دەبێت ... تۆ نە نەخۆش دەکەویتو نەدەمریت .. لەبەر ئەوە خوا دەپەرستیتو هەمیشە لەیادتە!
ئێمە ئادەمیزادین .. تینوومان دەبێو برسیمان دەبێو نەخۆش دەکەوینو دەمرین .. ئیتر چۆن خوا بپەرستینو هەمیشە لەیادمان بێت ؟!
بەڵام ئەگەر ئادەمیزاد بێت دەڵێن : خۆ منیش وەکو ئێوەم برسیم دەبێو تینووم دەبێو نەخۆش دەکەومو دەمرمو خوایش دەپەرستمو هەمیشە لەیادیشمە .. ئیتر ئێوە بۆ نایپەرستن ؟

## ١٠- نوح پەیامبەری خوایە:

خوای گەورە ، نوحی کردە پێغەمبەری خۆی بۆ سەر خەڵکی ئەو سەردەمە ، خوای گەورە بەتایبەتی نوحی هەڵبژراد .. چونکە خوا خۆی دەزانێ کێ دەتوانێ ئەو بەرنامەیە بەباشی بگەیەنێ بەخەڵکی نوح پیاوێکی باش بوو ... دڵ نەرم بوو .. ژیرو دانا بوو .

---

(*) ئەوانە ناوی بتەکانیان بوون کە دەیانپەرستن.

نوح زۆر ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد ، نوح راستگۆ بوو .. دەست پاك بوو ، نوح بەخەڵکی راگەیاند کە پێغەمبەری خوایە ، خوا ناردویەتی بۆ ئاگادار کردنەوەی ئەوان .. «انا ارسلنا نوحا الی قومه ان انذر قومك من قبل ان یأتیهم عذاب الیم» ..

## ١١- گەلەکەی وەڵامیان چی بوو؟

کاتێ نوح بەگەلەکەی راگەیاند ، کە پێغەمبەری خوایەو هاتووە بۆ سەر ئەوان ، زۆر لە خەڵکەکە وتیان :

- ئەمە لەکەیەوە بۆتە پێغەمبەر ؟
- دوێنێ پیاوێکی وەکو ئێمە بوو ، ئیمڕۆ بۆتە پێغەمبەر ..؟!

هاورێکانی نوح وتیان : ئەمە لە مناڵیا لەگەڵ ئێمە یاری دەکرد ، شەوو رۆژ بەیەکەوە بووین ، نازانین کەی ئەم پێغەمبەرایەتی‌یەی بۆ هات ..؟! دەوڵەمەندو دەمار زلەکان وتیان :

- خوا کەسی دەست نەکەوت بیکاتە پێغەمبەر نوح نەبێت ..؟!
- لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا ئەو هەژارەی دۆزی‌یەوە ..؟!

نەزانەکان دەیانوت : خۆ ئەویش وەکو ئێمە ئادەمیزادە ، وە دەیانوت : ئەگەر خوا بیەوێ فریشتەکان دەنێرێت .. هەندێ کەسیش دەیانوت : نوح کورسی‌و پلەو پایەی دەوێت ... بەم شێوەیە دەیەوێ پێ بگات ..!

## ١٢- لەنێوان نوح‌و گەلەکەی‌دا:

خەڵکی وایان دەزانی بت پەرستی راستە ، وەوایان دەزانی بت پەرستی ژیری‌یە ..!

وەدەیانوت : باو باپیرانمان بت پەرست بوون ، ئەی بۆچی ئێمەش بت نەپەرستین ؟

بەڵام نوح دەیزانی بت پەرستی نەزانینە .. رێ ون کردنە .. نوح دەیزانی باوو باپیران نەیانزانیوەو رێیان ون کردووە .. ئادەمی باوە گەورەی هەموان خوا پەرست بووەو بتی نەپەرستووە ، وەدەیزانی ئەم گەلە نازانن‌و سەریان لێ شێواوە ، بۆیە خوای گەورە ناپەرستن‌و بت دەپەرستن ، نوح هەستاو بانگەوازی خۆی ئاشکرا کرد ..

نوح وتی : ئەی خەڵکینە .. خوا بپەرستن ، چونکە لەو زیاتر هیچ خوایەکی کە نی‌یە ، من بەزەییم بە ئێوەدا دێتەوە ، چونکە لەدوارۆژدا بە ئاگری دۆزەخ ئازار دەدرێن .

خەڵکەکە وتیان : ئەی نوح تۆ رێگات ون کردووە . نوح وتی : خەڵکینە من رێگام ون نەکرردووە .. بەڵکو من لەلایەن خوای پەروەردگارەوە ، بۆ لای ئێوە رەوانە کراوم ، کە ئاگادارتان بکەم تەنها خوا بپەرستن .

نوح زۆر هەوڵی‌دا لەگەڵ ئەو خەڵکەدا کە بێنە سەر رێگای راست‌و رێگای خوا پەرستی .. بەڵام چەند کەسێکی کەم نەبێت کەس باوەڕی پێ نەکرد .. تەنها چەند کەسێك نەبێت کە بەئارەقی ناو چاوی خۆیان دەژیان‌و حەڵاڵیان دەخوارد ، بەڵام دەوڵەمەندەکانی گومرایی‌و فیز زلی رێگای نەدان کە باوەڕ بهێنن ، ئەوان سامان‌و ماڵی زۆر هەموو شتێکی لەبیر بردبوونەوە ، ئەوان دەیانوت : ئێمە گەورە پیاوانین ، ئەوانەی باوەڕیان بەنوح هێناوە لاتو لوتن .

بەنوحیان وت : چۆن دوای تۆ دەکەوین ، تۆ ئەو لاتو لوتانەت لەخۆت

کۆکردۆتەوە ..؟ تۆ ئەوانە دەرکە.
بەڵام نوح وتی: من خاوەن باوەڕەکان دەرناکەم، دەرگای من دەرگای پاشا نییە، من تەنها ئاگادار کەرەوەم، ئاگادار کردنم لەسەرە .. نوح دەیزانی ئەو هەژارانە خاوەن باوەڕی دڵسۆزن، ئەگەر دەریانکات خوای گەورە لێی زویر دەبێتو سەرکەوتووی ناکات ..
دەوڵەمەندەکان دەیانوت: ئەو بانگەوازەی نوح دەیکات راست نییە وە حەق نییە .. چونکە ئێمە لە هەموو خێرێکدا لەپێشەوە بووین .. هەموو پێویستییەکی ژیانمان هەیە، وە هەموو جلو بەرگو کەلو پەلێکمان هەیە .. وەخەڵکی هەمووی لەگەڵ ئێمەدایە .. تا ئێستا لەم شارەدا هیچ خێرێك لە ئێمەوە دوور نەبووە، وەئێستاش ئەگەر ئاینەکەی نوح راست بوایە، دەبوو لەپێش ئەو هەژارانەوە بۆ لای ئێمە بهاتایە ..

## ١٣ـ بانگەوازی نوح:

نوح بانگەوازی خۆی بەناو گەلەکەیدا بڵاو کردەوە .. ئامۆژگاری زۆری کردن کە خوای گەورە بپەرستن، بۆ ئەوەی لە گوناهەکانیان خۆش بێ، وە ئەگەر خوا نەپەرستن تەنها خۆیان زەرەر دەکەن، ئینجا خوای گەورە بارانی لێ گرتنەوە، خەشمگین بوو لێیان .. نەوەی کەم کردنەوە.
نوح وتی: ئەی گەلەکەم، ئەگەر باوەڕ بێنن بەخوا لێتان خۆش دەبێ، ئەو سزایەتان لەسەر هەڵدەگرێت .. وەبارانیش دەبارێنێتو رۆزیشتان زیاد دەکات .. نوح وتی: بۆچی سەیری دەورو پشتی خۆتان ناکەن ..؟ بۆچی سەیری ئاسمانو زەوی ناکەن ..؟ بۆچی سەیری خۆرو مانگو ئەستێرە ناکەن ..؟ کێ ئەم ئاسمانو زەوییەی دروست کردووە ..؟ کێ خۆری کردوە بەچرای سەر زەوی ..؟ کێ ئێوەی دروست کردووەو ئەم زەوییەی بەم شێوەیە بۆ ئێوە دروست کردووە ..؟
بەڵام گەلەکەی ژیر نەبوون، باوەڕیان نەهێنا، وەهەر کاتێ نوح بانگی دەکردن، پەنجەیان دەخستە گوێیان ..! ئەگەر گوێ نەگرێت، چۆن تێ دەگات؟ ئەگەر یەکێ نەیەوێ ببیستێ چۆن گوێ دەگرێ؟

## ١٤ـ پاڕانەوەی نوح:

نوح ماوەیەکی دوورو درێژ بانگی گەلەکەی دەکرد بۆ خوا پەرستی، نوح نۆسەدو پەنجا ساڵ ئامۆژگاری گەلەکەی کرد، بەڵام ئەو گەلە باوەڕیان نەهێنا.
تاکەی نوح چاوەڕێ بێت؟ تاکەی بروانێتە بەدڕەفتاری خەڵکی؟ تاکەی بروانێتە بەرد پەرستی؟ تاکەی بروانێت خەڵکی رۆژی دەخۆنو بەردیش دەپەرستن؟ تاکەی نوح تورە نەبێت؟
نوح ماوەیەکی زۆر درێژە ئارامی گرتووە، هیچ کەس ئەوەندە ئارامی نەبووە، نۆسەدو پەنجا ساڵ ئارام گرتن زۆر زۆرە ..!
خوای گەورە ئاگاداری نوحی کرد، کە جگە لەوانەی باوەڕیان پێت هێناوە ئیتر کەسی تر باوەڕت پێ ناهێنێ «انه لن یؤمن من قومك الا من قد آمن».
جارێکی تریش نوح بانگی گەلەکەی کردەوە بۆ خوا پەرستی، بەڵام گەلەکەی وتیان: ئەی نوح تۆ ماوەیەکی زۆرە هەر لەگەڵ ئێمە دەڵێی برۆ چی دەکەی بیکە ..!

نوح تووڕە بوو وەبێزاری لەدەست ئەوان دەربڕی، وەوتی: (ئەی خوای گەورە کەس مەهێڵە لەسەر ئەم زەوییەدا لەم کافرانە..!).

## ١٥ـ کەشتی:

خوای گەورە داواکاری نوحی وەرگرتو ویستی گەلەکەی لەدەریادا نوقم بکات، بەلام خوای گەورە دەبێ نوحو هاوڕێکانی بپارێزێو نەخنکێن.. لەبەر ئەوە فەرمانی کرد بەنوح کە کەشتییەك درووست بکات..

کەشتییەکی گەورە.. کاتێ خەڵکەکە چاویان کەوت بەنوح کەشتی دروست دەکات، گاڵتەیان پێ دەکرد، دەیانوت:

ـ ئەمە چییە ئەی نوح؟

ـ لەکەیەوە بووی بەدارتاش؟!

ـ ئێمە نەمانوت: لەگەڵ ئەو هەژارانەدا مەبە، بەلام تۆ بەقسەی ئێمەت نەکرد، تابووی بەدارتاش...! ئایا ئەم کەشتییە بەکوێدا دەڕوات؟ تۆ هەرچی دەکەیت زۆر سەیرە، ئایا ئەم کەشتییە بەناو لمدا دەڕوات؟ ئایا جنۆکە ئەم کەشتییە هەڵدەگرن، تا ئەو دەریا دوورە؟ یاخود بەگا رای دەکێشی؟

نوح، ئەم هەموو قسەو قسەڵۆکەی دەبیست، بەلام گوێی نەدەدایە، بەئارام بوو.. وەدەیوت: کاتێك دێت ئێمەش گاڵتە بەئێوە بکەین..!

## ١٦ـ لافاو:

پەیمانو بەڵێنی خوای گەورە کاتی هات! باران دەستی پێ کرد، باری... باری... باری... تا ئاسمان وەکو بێژنگ ئاوی بەخۆیەوە رانەدەگرت.. ئاو هەستا، تا هەموو کونو قوژبنی جیهانی پڕ کرد..!

خوای گەورەفەرمانی کرد بەنوح: خۆتو هەرچی باوەڕی پێ هێناوی لە کەشتییەکەدا هەڵیان گرە.. وەلەهەر جۆرە گیاندارێك جوتێك هەڵبگرە، نێرو مێیەك. چونکە ئەم لافاوە گشتییەو هەموو جیهان دەگرێتەوە لەبەر ئەوە هیچ شتێ دەرناچێ.

کەشتییەکە بەخۆیو سەر نشینەکانیەوە کەوتە سەر ئاو.. ئاو هەموو شیوو دۆڵێکی پڕ کرد.. خەڵکی روویان کردە شوێنە بەرزەکان.. شاخەکان.. بەلام ئیمڕۆ هیچ پەنایەك نییە (پەنای خوا نەبێت).

## ١٧ـ کوڕەکەی نوح:

نوح کوڕێکی هەبوو لەگەڵ کافرەکان بوو، نوح کوڕەکەی دی لەناو ئاوەکەداو پێی وت: کوڕەکەم سواربە لەگەڵ ئێمە، لەگەڵ کافران مەبە..! کوڕەکەی وتی: دەچمە سەر شاخێکی بەرز.. ئاو پێم ناگات.. نوح وتی: کوڕم ئیمڕۆ بێجگە لەپەنای خوا، هیچ پەنایەك نییە، بەلام شەپۆلی ئاو دووری خستەوەو خنکا، نوح پێی ناخۆش بوو کوڕەکەی خنکا، چونکە کوڕی بوو، نوح دەیویست لەقیامەتیشدا لە ئاگری دۆزەخ رزگاری بکات.. چونکە ئاگری دۆزەخ لە ئاو ناخۆشترە.. وەسزای دواڕۆژ توندترە لەسزای ئەم جیهانە.

بەڵێ .. بەڵێنی خوا راستە .. پەیمانی خوا راستە .. تەنها خاوەن باوەڕەکان رزگار دەکات .

## ١٨ـ لە تۆ نیـیە ئەی نوح:

نوح هاواری کردو لە خوا پاڕایەوە ، وە وتی : کوڕەکەم لە منە تۆش پەیمانت راستە ... باشترین داوەری .. بەڵام خوای گەورە ناڕوانێتە پشتو بنەماڵە ، تەنها دەڕوانێتە کردەوە ، کافر نەوەی پێغەمبەر نییە با کوڕیشی بێت .. خوای گەورە نوحی ئاگادار کردەوەو پێی راگەیاند : ئەو کوڕە لەتۆ نییە ، ئەوە کردەوەیەکی خراپە ، داوای شتێکم لێ مەکە کە خۆت نایزانی .. مەبە بەنەزانەکان .. نوح داوای لێ بووردنی لەخوای گەورە کرد ..

## ١٩ـ دوای لافاو:

بەپێی ویستی خوا کافرەکان هەموویان لەناو چوون ، ئینجا باران وەستایەوە ، ئاو وردە وردە کەوتە کەم بوونەوە .. کەشتی‌یەکە لەسەر شاخی جودی( * ) وەستایەوە ، خوا فەرمانی کرد بەنوح : بەئاشتیو ئازادی دابەزنە سەر ئەو شاخە .. نوحو هاوڕێکانیو هەموو گیاندارەکان هاتنە سەر زەوی ، هەموو کافرەکانیش لەناو چوون .
خوای گەورە بەرەکەتی خستە نەوەی نوح .. زۆر بوون ... دنیایان پڕ کرد ، زۆر نەتەوەو گەلیان دروست کرد .. پێغەمبەرانو پاشایانیان تێدا هەڵکەوت ...
ـ سڵاو لەسەر نوح بێت .. سڵاو لەسەر گیانی هەموو پێغەمبەران بێت ! .. سڵاو لەسەر محمدی پێشەوامان ! ..

**وانەی سێیەم:**

# چیرۆکو بەسەرهاتی داود پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت):

حەزرەتی داود ( سەلامی خوای لێ بێت ) یەکێکە لەپێغەمبەرانی نەتەوەی ئیسرائیل ، خوای گەورە نیعمەتی پێغەمبەرایەتیو پاشایەتیشی پێکەوە پێ بەخشی ، وە خێرو بێری زۆری دنیای رژاندبوو بەسەریا ، وەیەکێکە لەو پێغەمبەرانەی کە کتێبی ئاسمانی بۆ هاتۆتە خوارەوە بەناوی ( زەبوور ) «وآتینا داود زبورا» ..
بۆ یەکەم جار کە داود لەناو خەڵکیدا ناسراو ناوبانگی دەرکرد ، سەربازێك بوو لەناو لەشکری طالوتا ، وە لەکاتی جەنگی طالوت لەگەڵ لەشکری جالوتدا بوو ، داود لەو جەنگەدا توانی دەستەو یەخەی جالوت ببێو لە مەیدانی جەنگدا بیدات بە زەویداو بیکوژێت ، ئەمە لە کاتێکدا جالوت پاڵەوانێکی زۆر ئازاو بەناوبانگ بوو .
ئێستاش بابزانین طالوت کێیەو جالوتیش کێیە ؟

---

(*) جودی: شاخێکە لە کوردستانی باکور.

دوای ئەوەی حەزرەتی موسا ( سەلامی خوای لێ بێت ) کۆچی دوایی کرد ، نەوەی ئیسرائیل رویان کردە فەلەستین ، وەیەکەم شار کەتێی چوون شاری ئەریحا بوو ، خوای گەورە فەرمانی پێ کردن کە بەترسی خواوە بچنە ئەو شارەو بپارێنەوە ، کە خوا لە گوناهەکانیان خۆش بێت ، بەلاّم ئەو گەلە سەرکەش بوونو بەپێچەوانەی فەرمانی خواوە ، بە لەخۆبایی بوونەوە چوونە شارەکەو دەستیان کرد بەتاوانو خراپەکاری تێیدا ، لەبەر ئەوە خوای گەورە سزایدان .

لەو سەردەمەدا نەتەوەی ئیسرائیل لە گەلانی دراوسێیانەوە چەندین هێرش دەکرایە سەریان ، ئەمانیش عادەتیان وابووە لە کاتی جەنگدا تابوتێکیان لەگەڵ خۆیان دەبرد بۆ گۆڕەپانی جەنگ ، ناویان نابوو تابووتی ( عهد ) بۆ ئەوەی بەسەیر کردنی ورەیان لە جەنگەکەدا بەرز ببێتەوە .

بەلاّم لە یەکێ لەو جەنگانەدا کە لەگەڵ فەلەستینی‌یەکان کردیان ، خوای گەورە فەلەستینیەکانی زاڵ کرد بەسەریانداو تالاّنیان کردنو تابووتەکەشیان لێ سەندنو بردیان .

بەو شێوەیە شپرزەییو پارچە پارچەیی سەری تێ کردبون ، لەو سەردەمەدا لەناو ئیسرائیلی‌یەکاندا پێغەمبەرێك هەبوو ؛ خەڵکی چوونە خزمەتی داوایان لێ کرد کە پاشایەکیان بۆ دابنێ ، ئەویش پاش ماوەیەك ئاگاداری کردن کە خوای گەورە طالوتی هەڵبژاردووە کە ببێ بە پادشایان ، بەلاّم ئەوان پێی رازیی نەبوون ؛ وە وتیان چۆن دەبێت لەناو ئەم هەموو خەڵکەدا پیاوێکی هەژاری وەکو طالوت ببێ بە پادشامان ، کە نەلەبنەماڵە ناودارەکانە ، وەنە دەوڵەمەندیشە،ئەو پێغەمبەرە پێی وتن : خوای گەورە بۆیە طالوتی هەڵبژاردووە لێهاتووەو زۆر سیفاتی تێدایە کە لە دەوڵەمەندو بنەماڵە ناودارەکاندا نییە ، خوای گەورە زانیاریو داناییو ئازایەتیو بەجەرگی پێ بەخشیووە ، وە هەروەها لەکاتی جەنگدا زۆر ئاراەو خۆراگرە . .

« وقال لهم نبيهم ان الله قد بعث لكم طالوت ملكا قالوا انیٰ يكون له الملك علينا ونحن احق بالملك منه ولم يؤت سعة من المال قال إن الله اصطفه عليكم وزاده بسطة في العلم والجسم والله يؤتي ملكه من يشاء والله واسع عليم » . . البقرة (٢٤٧)

ئەو پێغەمبەرە بە ئیسرائیلی‌یەکانی وت : یەکێ لە نیشانەکانی پاشایەتی طالوت ئەوەیە کە لە جەنگدا سەرکردایەتیتان دەکات بۆ سەرکەوتنو سەردەکەوێو تابوتەکەشتان بۆ دەسێنێتەوەو دەیگێڕێتەوە بۆتان .

« وقال لهم نبيهم إن ءاية ملكه أن يأتيكم التابوت فيه سكينة من ربكم وبقية مما ترك اءالُ هارون تحملة الملئكة إن في ذلك لأية لكم إن كنتم مؤمنين » البقرة٢٤٨.

## ـ طالوت لەشکرەکەی تاقی دەکاتەوە:

طالوت جاریدا بەناو گەلەکەیدا کە هەموویان خۆیان ئامادە بکەن بۆ ( جهاد ) لە رێگای خوادا ، دژی ئەوانەی کە ماوەیەك لەوەو پێش ئەمانیان لە جەنگدا بەزاندبوو . .

بەو شێوەیە لەشکرێکی زۆری کۆ کردەوە ، کەوتنە رێ بەرەو جەنگ دژی فەلەستینی‌یەکان ، جالوت سەکردەی فەلەستینی‌یەکان بوو ؛ پیاوێکی ئازاو بەجەرگ بوو ، ناوبانگی بە هەموو ناوچەکانی دەوروبەریاندا بلاّو بوو بووەوە ، وەزۆری لێ

دەترسان . .
لەشكری طالوت كەوتە ڕێ ، لە ناوچەكەی خۆیان دور كەوتنەوە ، زۆر هیلاك بوو بوون ، وە نزیك كەوتبوونەوە لە لەشكرەكەی جالوت ، طالوت ویستی خۆگری و گوێ ڕایەڵی لەشكرەكەی تاقی بكاتەوە ، پێی وتن : ئێمە ئێستا دەگەینە رووبارێك ، نابێ هیچ كەس لەو رووبارە جگە لە ( یەك قووم ئاو كە دەمتانی پێ تەڕ بكەن ) ئاو بخواتەوە ، هەر كەس لەوە زیاتر نەخواتەوە ئەوە لایەنگری منە ، بەلام ئەوەی بخواتەوە ، ئەوە لە تاقمی من نییەو لێی رازی نیم .
كاتێ گەیشتنە رووبارەكە زۆربەیان بێ گوێیان كردو دەستیان كرد بە ئاو خواردنەوە ، «فلما فصل طالوت بالجنود قال ان الله مبتليكم بنهر فمن شرب منه فليس مني ومن لم يطعمه فانه مني الا من اغترف غرفة بيده ، فشربوا منه الا قليلا منهم . . .» البقرة-٢٥٠.

## - سەركەوتنی طالوت:

طالوت خۆیی و ئەوانەی بە قسەیان كردو ئاویان نەخواردەوە ، لە رووبارەكە پەڕینەوە ، بەلام ژمارەیان زۆر كەم بوو ، زۆر كەمتر بوون لە ژمارەی لەشكری دوژمنەكانیان ، هەندێكیان دەیانووت : ئێمە بە جالوت ناوێرین ، بەلام ئیماندارە بەهێزەكانیان ، لە زۆری ژمارەی دوژمن نەدەترسان ، چونكە دڵنیا بوون ئەوان ئەم كارە بۆ ڕەزامەندی خوا دەكەن ، ئەگەر بكوژرێن ئەوا بۆ لای خوا دەگەڕێنەوەو خوا پاداشتیان دەداتەوە ، لەبەر ئەوە دەیانووت : زۆر جار رووی داوە كە كۆمەڵێكی كەم بەكۆمەكی خوای گەورە سەركەوتوو بوون بەسەر كۆمەڵێكی گەورەدا .
بەو شێوەیە شەڕ لەنێوان لەشكری كەمی طالوتو لەشكری زۆری جالوتدا بەرپا بوو . «قال الذين يظنون أنهم ملقوا الله كم من فئة قليلة غلبت فئة كثيرة بإذن الله والله مع الصابرين* ولما برزوا الجالوت وجنوده قالوا ربنا أفرغ علينا صبراً وثبت أقدامنا وأنصرنا على القوم الكافرين» . .
داود كە سەربازێك بوو لەناو لەشكرەكەی طالوتدا ، غیرەتی نایە بەر خۆیو روی كردە گۆڕەپانی جەنگو دەستەو یەخەی جالوتی پاڵەوانی دوژمنەكانیان وەستاو بەیارمەتی خوا توانی بیدا بەزەویداو بیكوژێت .
بەو شێوەیە داود ناسراو ناوی دەركرد لەناو خەڵكیدا ، وەڕێزێكی زۆری بۆ خۆی بەدەست هێنا لە دڵی طالوتدا ، لە دوای طالوت داود بو بە پاشای ئیسرائیلییەكان . .
كاتێك داود بوو بە پاشا ڕۆژەكانی دابەش كرد بوو بەچوار بەشەوە : ڕۆژێك بۆ خوا پەرستی ، ڕۆژێك بۆ دادوەری ، ڕۆژێك بۆ ئامۆژگاری ، ڕۆژێكیش بۆ پشوودان .
ڕۆژێك لە ڕۆژەكانی پشوودا ، لە پڕ دوو كەس بەبێ ئەوەی ئاگای لێیان بێت خۆیان كرد بەژوورەكەیدا ، ئەویش زۆر ترسا لێیان ، بەلام وتیان : مەترسە ئێمە كێشەیەكمان هەیە ، هاتووین بۆ خزمەت بەڕێزتان بۆ چارەسەری .
یەكەمیان وتی : ئەم پیاوە كە هاوڕێمەو برای ئایینیمە ، نەوەتو نۆ ( ٩٩ ) بزنی هەیە ، منیش تەنها یەك بزنم هەیە ، كەچی تەماعی كردۆتە ئەو تاكە بزنەی منو دەیەوێ لێم بستێنێ بۆ خۆی .

کاتێ داود ئەمەی بیست پێی ناخۆش بوو، وەوتی: هاورێکەت ستەمت لێ دەکات؛ تۆ خاوەن هەقی، یەکسەر لەو کاتەدا داود ئەوەی هات بەبیردا کە ئەمە تاقی کردنەوەیەکی خوایە بۆ من! ئاگادارم دەکاتەوە کە من کارێکم کردووە نەدەبوو بیکەم، ئەو کارەش ئەوە بوو کە رۆژێکی دانابوو بۆ پشووی خۆی، لەبەر ئەوە پەشیمان بوویەوەو زۆر لە خوا پاڕایەوە کە لێی خۆش ببێت، وەسەری بەندایەتی بۆ شۆڕ کردو کرنووشی بۆ خوا برد..

«وهل اتاك نبؤا الخصم إذ تسوروا المحراب * إذ دخلوا على داود ففزع منهم قالوا لاتخف خصمان بغى بعضنا على بعض فأحكم بيننا بالحق ولا تشطط وأهدنا إلى سواء الصراط * إن هذآ أخي له تسعٌ وتسعون نعجة ولي نعجةٌ واحدةٌ فقال أكفلنيها وعزني في الخطاب * قال لقد ظلمك بسؤال نعجتك إلى نعاجه وإن كثيراً من الخلطاء ليبغي بعضهم على بعض إلا الذين ءامنوا وعملوا الصالحات وقليلٌ ماهم وظن داود أنما فتنّهُ فأستغفر ربهُ وخر راكعاً وأناب».. ص(٢٤)

## ـ دادگایی کێشەی جوتیارەکە:

شەوێك رانە مەڕێك رایدا بوو، وەچوو بوە ناو کشتوکاڵی جوتیارێکەوە، وەخاوەن مەڕەکە نەی زانیبوو، خاوەنی کشتوکاڵەکە هاتە خزمەت حەزرەتی داود شکاتی لە خاوەن مەڕەکان کرد، وەوتی: ئەی پێغەمبەری خوا: درووێنەو هەڵگرتنی بەروو بوومەکەی هاتبوو، کەچی دوێ شەو رانە مەڕی فلانە کەس رای داوەو تێی کەوتووەو خواردوویەتی.

داود (سەلامی خوای لێ بێت) بە خاوەن مەڕەکانی وت: ئایا ئەم پیاوە راست دەکات؟ کابرا وتی بەڵێ راست دەکات.

پرسی لە جوتیارەکە: نرخی ئەو بەرهەمەتان کە خوراوە بەچەند دادەنێن؟ ئەوانیش ئەندازەیەکیان دیای کرد.

بە خاوەن مەڕەکانی وت: ئێوە نرخی مەڕەکانتان بەچەند دادەنێن؟ ئەوانیش نرخێکیان دیاری کرد.

کاتێ داود سەیری کرد هەردوو نرخەکە لە یەکەوە نزیکن، بە خاوەن مەڕەکانی وت: دەبێ ئێوە مەڕەکانتان بدەن بەخاوەن کشتوکاڵەکە؛ لەبری ئەو زیانەی لێی کەوتووە.

حەزرەتی سولەیمان کە کوڕی حەزرەتی داود بوو گوێی لەم قسەیە بوو، یەکسەر رووی کردە باوکیو وتی: بابە گیان من بیرو رایەکی جیاوازم هەیە بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە، ئەویش ئەمەیە: خاوەن مەڕەکان، مەڕەکان بدەن بە جوتیارەکە، ئەوان بەروو بوومی مەڕەکان بخۆن، وەجوتیارەکەش زەویەکە بدات بەخاوەن مەڕەکان بەرهەمی بهێنێو خزمەتی بکەن هەتا دەگاتە کاتی بەرهەم هەڵگرتنو درووێنە کردن، ئەو کاتە کشتوکاڵەکە بداتەوە بەجوتیارەکەو مەڕەکانی خۆی وەربگرێتەوە.

هەموویان بەم دادگایە رازی بوونو زۆریان پێ خۆش بوو، حەزرەتی داود فەرموی: کوڕم بەڕاستی چارەی دادگەرانەت بۆ دانان.. «وداود وسليمان إذ يحكمان في الحرث إذ نفشت فيه غنم القوم وكنا لحكمهم شاهدين * ففهمناها سليمان وكلا

ءاتينا حكماً وعلماً » الانبياء-٧٨-٧٩.
حەزرەتی داود پیاوێکی زۆر لەخوا ترس بوو ، هەمیشە لەخوا پەرستیدا بوو ، وەزۆر لەخوا دەپارایەوە ، خوای گەورە شاخەکانی خستبووە ژێر دەسەلاتیەوە ، هەروەها باڵندەی کردبووە هاوڕێی کە هەموو پێکەوە یادی خوایان دەکرد .. « ولقد ءاتینا داود منا فضلا یاجبالُ أوبي معهُ والطیر ... » .

## - موعجیزەکانی حەزرەتی داود:

خوای گەورە ئاسنی نەرم کردبوو لەبەر دەستی داودا ، هەرچییەکی بویستایە لە ئاسن دروستی دەکرد ، وەك قەڵغانو تفاقی پێویسی جەنگ .. « ... والنا له الحدید ، ان اعمل سابغات وقدر في السرد وعملوا صالحا اني بما تعملون بصیر » ..

## وانەی چوارەم:

# چیرۆكو بەسەرهاتی سێ کەسی ناو ئەشکەوتەکە:

ئەبو عەبدولرەحمان ، عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب مەشهوور بە ئیبنو عومەر ( رەزای خوای لێ بێت ) فەرموی : لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرمو : جارێ سێ کەس ( لە پێشینان ) بەرێگەیەکا دەڕۆیشتن باران دایگرتن ، ئینجا شەو پەنایان بردە بەر ئەشکەوتێ لە کێوێ ، تاوێرە بەردێك لە کێوەکەوە گل بۆوەو دەرگای ئەشکەوتەکەی گرت ، جا لەناو خۆیاندا گووتیان سەیر بکەن بزانن چی کردەوەیەکی باشتان کردووە بۆ خودا بەو کردەوانە لە خودا بپاڕێنەوە بەڵکو خودا دەرووتان لێ بکاتەوەو لەم تاوێرە بەردە رزگارتان بکات .
یەکێکیان وتی : ( خودایە ! خۆت ئاگاداری کە من باوكو دایکێکی پیرو ئیختیارو چەند منداڵێکی وردیشم هەبوون ، شوانیم بۆ دەکردن ، هەموو جارێ کە دەگەڕامەوە بۆماڵەوە رانەکەم دەکردە پەچەوەو شیرم دەدۆشیو لەپێشدا دەرخواردی باوكو دایکم دەدا پاشان بەشی مناڵەکانیشم دەدا ، تا رۆژێ بەشوێن لەوەڕی باشدا دور کەوتمەوەو درەنگم بەسەرهاتو کە هاتمەوە شەو بوو ، روانیم باوكو دایکم خەوتوون ، منیش وەك جاران شیرم دۆشیو بۆم بردنو بەدیار سەریانەوە راوەستام ، تاکەی خەبەریان بۆوە شیرەکەیان بخۆنەوە ، بەڵام حەزم نەکرد کە خەبەریان بکەمەوەو پێشم ناخۆش بوو کە بەر لەوان شیر بدەم بە منداڵەکان ، منداڵەکانیشم لەو ماوەیەدا لەبەر پێما لەبرساندا هەر دەکروزانەوە ، تا شەبەقیدا ، ئەمە حاڵمان بوو ) ، جا ئەی خودایە ! تۆ دەزانی ئەگەر ئەمەم لەبەر رەزامەندی تۆ کردووە ئەوا دەروویەکمان لێ بکەرەوەو کەلەبەرێکمان بۆ بکەرەوە کە ئاسمانی لێوە ببینین !
جاخودا کەلەبەرێکی بۆ کردنەوەو ئاسمانیان لێوە دیو تاوێرەکە تۆزێ خزا بەڵام نەیان توانی دەربچن ..
یەکێکی تریان گوتی : ( خودایە ! خۆت ئاگاداری کە کچێکی ئامۆزام هەبوو ، چەندە

پیاو حەز لە ئافرەت دەکات ئەوەندە حەزم لێ بوو ، کە داوای ئیشی خراپەم لێ کرد خۆی نەدا بەدەستەوە ، هەتا ساڵێکیان دووچاری گرانیو قاتو قڕی بوو ، وە بەناچاری هات بۆ لام ، سەدو بیست دیناری زێڕم داپێی لەباتی ئەوەی کە خۆییم تەسلیم بکات ، ئەویش وای کرد ، جاکاتێ دەستم لێی گیر بوو ، وە لەناو کۆشیا دانیشتمو ویستم بەدەستی بگرم ، کچەکە گوتی : ئەی عەبدوڵڵا ! ئەی بەندەی خوا ! لە خودا بترسەو ئەم مۆرە بەنارەوا مەشکێنە ، ئیتر منیش هەڵساموو وازم لێ هێناو پارەکەیشم دایە بۆ خۆی ، وەلەو حاڵەتەدا زۆر زۆریش حەزم لێی بوو ) ، جا ئەی خودایە ! تۆ دەزانی ئەگەر ئەمەم لەبەر رەزامەندی تۆ کردووە ئەوا دەروویەکمان لێ بکەرەوە لەم سەختڵەتی‌یە .

ئیتر خودا دەروویەکی تری لێ کردنەوەو تادوو بەشی تاوێرەکە لەسەر دەرگاکە لاچوو . . .

سێیەمیان گوتی : ( ئەی خودایە ! تۆ خۆت ئاگات لێیە کەمن جارێ چەند کرێکارێکم بەکرێ گرت کە ئیشەکەیان تەواو کرد کرێکەیانمدا جگە لەیەکێکیان نەبێ گوتم کرێکەت ئەوەتانێ ، کەچی وەری نەگرتو رۆیشت ، منیش پارەو کرێی کرێکارەکانی ترم هەموودا ، وە کرێکەیم خستە ئیشو کارەوە ، وەبەرهەمم هێنا تاوا زۆر بوو گاگەلێکو وشترو مەڕو چەند بەندەیەکی شوانم پێ کری ، تارۆژێ کرێکارەکە هاتەوە بۆ لام گوتی : لە خودا بترسە کرێکەم بدەرێ منیش گوتم : برۆ ئەو رانە وشترو گاگەلو رانە مەڕو شوانەکانیان ببە بۆ خۆت ، هەمووی هی کرێکەتە ، گوتی : ئەی بەندەی خوا !! لە خودا بترسە گاڵتەم پێ مەکە ، منیش گوتم : بەڕاستمە ، گاڵتەت پێ ناکەم هەمووی هی خۆتە ببە ، ئیتر ئەویش هەمووی برد بۆ خۆی ) . .

جا ئەی خودایە تۆ دەزانی ئەگەر ئەمەم لەبەر خاتری تۆ کردووە ئەوا دەرگای ئەشکەوتەکەمان بەتەواوی بۆ بکەرەوە ، جا خودا دەرگاکەی تەواو بۆ کردنەوەو تاوێرەکە خزاو هاتنە دەرەوەو رۆیشتن . .

---

سەرچاوە : (ریاض الصالحین) متفق علیه . .

## وانەی پێنجەم :

# چیرۆکی (مانگاکەی نەوەکانی ئیسرائیل)

رۆژێ لەرۆژان پیاوێ لە نەوەکانی ئیسرائیل کوژرا ، مشتو مڕو دووبەرەکیو نیزاع کەوتە ناویانەوە ، هەموو کۆمەڵێ دەیویست تاوانەکەی لەسەر خۆی لابەرێ ، پاشان هاتن بۆ لای پێغەمبەرەکەیان ( موسا ) سەلامی خوای لەسەر بێت ، تا بەدادو هەقیانەت رێکیان بخاتو بزانێ کێ پیاوەکەی کوشتووە ، موسا ( سەلامی خوای لێ بێت ) هەڵساو نوێژی کردو کڕنووشی برد بۆ خوای گەورەو زانا ، وەداوای لێ کرد کە هەقیان بۆ دەربخات ، تا پیاو کوژەکە تۆڵەی کردەوەکەی لێ بکرێتەوەو سزا بدرێ ، وە ئەم

هەرایەش کۆتایی پێ بێ کە لەناو نەوەکانی ئیسرائیلدا دروست بووە، خوای گەورە نیگا (وحي)ی نارد بۆ موسا کە فەرمان بەقەومەکەی بکات کە مانگایەك سەر ببرن، پاشان بەشێ لە مانگاکە بگرنو بیدەن لە کوژراوەکە بەئیزنی خوا چاك دەبێتەوەو پێیان دەڵێ کێ کوشتوویەتی (موسا) پێی وتن «ان الله يأمركم أن تذبحوا بقرة» خوا فەرمانتان پێ دەکا کە مانگایەك سەر ببرن.

لێرەدا پێویست بوو لەسەر نەوەکانی ئیسرائیل کە گوێ رایەڵو مل کەچ بن بۆ فەرمانی خواو مانگایەك سەر ببرن هەر مانگایەك بێت، بەڵام فەرمانی خوایان بەجێ نەهێنا، وەلەموسایان پرسی بەسەر سوورمانەوە «اتخذنا هزوا»؟ ئەی موسا تۆ دەمانگێری بەگاڵتە پێکراوی خۆت، مانگا پەیوەندی چییە بەکوژراوەوە موساش پەنای گرت بەخوا لەبێ هۆشی قەومەکەی چونکە ئەوان دەزانن موسا پێغەمبەری خوایە ئەمەش کەدەیڵێ فەرمانی خوایە، وەئەو تەنها راگەیاندنی لەسەرەو بەس، موسا وتی: من پەنا دەگرم بەخوا کە لە نەزانان بم گاڵتە جاری بکەم.

فەرمانی خوا گشتییە مانگایەك سەر ببرن هەر مانگایەك بێت عومری (تەمەن)ی بچوك بێ یا گەورە، سپی بێ یا رەش یا زەرد یا سوور، ئەگەر ئێوە سەرتان بری ئەوە فەرمانی خواتان بەجێ هێناوە بەڵام دڵەکان وەك بەرد وان چونکە نایانەوێ فەرمانی خوا بەجێ بهێنن، ئەگینا ئەوەتا فەرمانیان پێ دەکا مانگایەك سەر ببرن ئەوان دڵیان وەك بەرد وایە بەڵکو لەبەردیش رەقترە دەڵێن: مانگا پەیوەندی چییە بەو مەسەلەیەوە، ناڵێن ئەمە خوا پێی فەرمووە لەخۆیەوە ناڵێ، وەداوا لەموسا دەکەن کە بەپەروەردگارەکەی (خوا)کەی بڵێ بۆمان روون بکاتەوە کامەیە ئەو مانگایە؟ «قالوا ادع لنا ربك يبين لنا ماهي»..

موسا پێی وتن: مانگایەکە، مانگایەکەو بەس.. موسا داوای لە خوا کرد، خوای گەورەش نیگای بۆ نارد فەرمووی: «انها بقرة لا فارض ولا بكر عوان بين ذلك».. مانگایەکە عومری (تەمەن)ی کەم نییە لەو بەینەدایە واتە ناوەنجییە واتە نەگەورەیە نەبچوکە، پاشان موسا ترساندنی بە «افعلوا ما تؤمرون» ئەوەی فەرمانتان پێ دراوەو بۆتان روون کرایەوە بیکەن.

بەڵام ئەوان بەردەوام پرسیار دەکەن وتیان «قالوا: ادع لنا ربك يبين لنا مالونها»؟ ئەی موسا بەپەروەردگارەکەت بڵێ رەنگی چۆنە بۆمان روون بکاتەوە؟ خواش زۆر بەروونو ئاشکرایی وەڵامی دانەوە، موسا پێی وتن: «قال انه: يقول: انها بقرة صفراء فاقع لونها تسر الناظرين» خوا دەفەرموێ مانگایەکی زەردی سادەی رەنگ گەشە تەماشاکەران دڵخۆشو سەرسام دەکات لەبەر جوانییەکەیو رێكو پێکی لاشەی مانگاکە.

لێرەدا پێویست بوو لەسەر نەوەکانی ئیسرائیل کەچی تر پرسیار نەکەنو بگەرێن بەشوێن مانگایەکی تەمەن ناوەنجی رەنگ زەردێکی گەش وەسەری ببرن بەڵام بۆ جاری سێیەم پرسیاریان لە موسا کردەوەو وتیان «قالوا ادع لنا يبين لنا ماهي؟ ان البقر تشابه علينا وانا ان شاءالله لمهتدون» ئەی مووسا بەپەروەردگارەکەت بڵێ بۆمانی روون بکاتەوە کامەیە؟ چونکە مانگاکەمان لاروون نییە، وەخوا حەز بکات رێگای راست دەگرین بۆ سەربڕینی مانگاکە پاش ئەوەی زانیمان کامەیە، چونکەمانگای لەو تەمەنەداو رەنگ زەرد زۆرە، وەئێمە نازانین کام مانگایە سەر

ببڕین ، بەم شێوەیە نەوەکانی ئیسرائیل فەرمانی خوایان لەسەر خۆیان گران کرد ، خواش لەسەری قورس کردن دەبوو هەر ئەو مانگایە سەر ببڕن بۆیان دەست نیشان کراوە .

موسا وتی : « قال انه يقول انها بقرة لاذلول تثير الارض ولا تسقى الحرث مسلمة لا شية فيها » مانگایەکە زەبوونو زەلیل نییە وەنەخراوەتە ژێر جووتەوەو زەوی پێ بکێڵرێ ، یا نەخراوەتە ژێر ناعوورەوە ئاوی کشتوکاڵی پێ بدەن ، وەهیچ لەرەنگی تێك نەچووە ، رەنگی زەردەو هیچ رەنگێکی تری تێکەڵاو نەبووە .

لێرەدا نەوەکانی ئیسرائیل مل کەچ بوون بۆ فەرمانی خوا وتیان ئێستە بەباشی بۆت روون کردینەوە « قالوا الان جئت بالحق » .. پاشان گەڕان بەشوێن مانگادا لەسەر ئەو ناونیشانەی کەبۆیان دەست نیشان کراوە تا دۆزیانەوە لەسەر ئەو وەسفو شێوەیە مانگاکە هی کوڕێ بوو کە دایکێکی پیری هەبوو تا بەپارەیەکی زۆر رازییان کردو لێیان کری ، وەخەریك بو سەری نەبڕن ، چونکە کوڕەکە بەهۆی دایکییەوە داوای پارەیەکی زۆری دەکرد ، ئەو کوڕە خزمەتی دایکی دەکرد وە لەقسەی دەرنەدەچوو ، بۆیە کەپێیان وت ئەو مانگایەمان پێ بفرۆشە بە ئەوەندە وتی بابچم بزانم دایکم دەڵێ چی دایکی هەمیشە دەیوت داوای زیاتر بکە تاچەند جارێ هاتو چوو لەلای کریارەکانەوە بۆ لای دایکی تا بەپڕی پێستەکەی زێڕ ، لە کوڕەکەیان کری وەسەریان بڕی ، وەبەشێکی مانگاکەیان گرتو دایان پێی لەکوژراوەکەوە بە فەرمانی خوا کوژراوەکە زیندوو بووەوەو وتی : فلأن کەس کوشتمی ، کوڕی مامم !!

## پەندو ئامۆژگاری:

١. خوا فەرمانی دا بەنەوەکانی ئیسرائیل کا مانگایەك سەر ببڕن بێجگە لە هەموو گیاندار ( حیوان )ێکی تر چونکە دەیانپەرست ، وەویستی ئەو گەورەییەی مانگا لەدڵیاندا دەربهێنێو نەمێنێ ، وەنەوەکانی ئیسرائیل گوێرەکەیان پەرست دوای ئەوەی کە موسا رۆی بۆ خزمەت خوای گەورە لە کێوی ( طوری سینا ) وە هاروونی برای کرد بەجێ نشینی خۆی لەناویاندا ، پیاوێك کە ناوی ( سامری ) بوو گوێرەکەیەکی لە ئاڵتوون بۆ دروست کردن دەنگی لێوە دەهات وەپێی وتن : ئەمە خواکەتانەو خوای موسایە ، ئەوانیش پەرستیان ، خوا دەفەرموێ « واذ واعدنا موسى اربعين ليلة ثم اتخذتم العجل من بعده وانتم ظالمون » .

٢. موسا بەنەوەکانی ئیسرائیلی وت : « ان الله يأمركم ان تذبحوا بقرة » خوا فەرمانی سەربڕینی مانگایەکتان پێ دەکات ، ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵیو مل کەچی فەرمانی خوایان بکردایە وەك هاتە خوارەوە ئەوە بۆ ئەوان خێری زۆرتر بوو ، بەڵام لەسەر خۆیان قورس کردن پاش ئەوەی خوا فەرمانی سەربڕینی مانگایەکی پێ کردبوون ، هەر مانگایەك بوایە دەبوو ، بوو بە مانگایەکی دەست نیشان کراو وەنەدەبوو هەر مانگایەك بێ سەری ببڕن ، چونکە لەسەرەتاوە فەرمانی خوایان بەجێ نەهێنا ؛

٣. لەم چیرۆکەدا دەسەڵاتو توانای خوا دەردەکەوێ لەزیندوو کردنەوەی مردوان سەر لەنوێ گیانی کردەوە بەبەر ئەو کوژراوەداو لەناویاندا بەربووە قسە کردنو بۆ

ئامادە بوانی ئاشکرا کرد کێ کوشتوویەتی هەروەك چۆن خوای گەورە ئەم مردووەی زیندوو کردەوە ئاواش لەرۆژی قیامەتدا هەموو خەڵکی زیندوو دەکاتەوەو لەگۆڕەکانیان دێنە دەرەوە تا حسابیان لەگەڵدا بکرێ لەسەر ئەوەی لەدنیادا کردوویانە هەر کەسێ چاکەی کردبێ بۆ بەهەشت ، هەرکەسێ خراپەی کردبێ بۆ ئاگر . .

تێبینی: مەبەست لە نەوەکانی ئیسرائیل نەوەی کوڕانی (یەعقوب پێغەمبەرن)..

## وانەی شەشەم:

# چیرۆکی قەلەڕەش لەگەڵ هابیلو قابیل

قەلەڕەش باڵدارێکە خوای بێ وێنە ناردی بۆ ( قابیل )ی کوڕی ( ئادەم ) تا فێری بکات چۆن ( هابیل )ی برای بشارێتەوەو دفنی بکات پاش ئەوەی کە کوشتی . .

ئەو چیرۆکە لەو کاتەوە دەستی پێ کرد کە باوکمان ( ئادەم ) وە دایکمان ( حەوا ) سەلامی خوایان لێ بێت بەفەرمانی خوا لەبەهەشت دەرکران بۆ سەر زەوی ، پاش ئەو رووداوەی کە شەیتان فریوی‌دانو فەرمانی خوای لەبیر بردنەوە لەو دارەیان خوارد کە خوا لەسەریانی حەرام کردبوو .

لەسەر زەویدا خوای گەورە دوو کوڕی بەخشی بە ئادەم ( قابیلو هابیل ) هابیل : کوڕێکی لەخوا ترس‌بوو ، خاوەن دڵو دەروونێکی پاكو بێگەرد بوو . . قابیل : خاوەن دڵو دەروونێکی پیسو چەپەڵ بوو دڵی پڕ بوو لە رقو کینە . .

رۆژێ لە رۆژان ئادەم فەرمانی کرد بە دوو کوورەکەی کە هەریەکەی شتێك بکەن بە قوربانی‌و بەختی کەن لەپێناوی خوادا واتە هەریەکەو هەندێ لەوەی کە هەیانە پێش کەشی بکەن لەبەر رەزامەندی خوا ، قابیل جووتیارێ بوو زەوی دەکێڵاو تۆوی پێوە دەکرد ، لەو کشتوکاڵەی دەیکرد نابووت ترین شتی هێناو کردی بەقوربانی ، بەڵام هابیل شوان بوو مەڕی بەخێو دەکرد ، کاوڕێکی قەڵەوی هەڵبژارد کە زۆر خۆشی دەویستو زۆر دڵی پێوەی بوو هێنای پێش کەشی کرد . .

خوای گەورەش کاورەکەی هابیلی قبووڵ کرد چونکە تەنها لەبەر خاتری خوا پێش کەشی کردبوو . ، وەشتێکی پێش کەش کرد خۆشی دەوویست ، بەڵام خوای گەورە کشتووکاڵەکەی قابیلی وەرنەگرت ، چونکە لەبەر رەزامەندی خوا نەبوو ، وەتەنها مەبەستی پێی خوا نەبوو ، قابیل تووڕە بوو وەشەیتان چووە بن کڵیشەیەوەو وای خستە مێشکی‌یەوە کە خوا هابیلی لاگەورەترەو بەڕێزترە ، بۆیە واپێویست دەکات براکەی بکوژێ .

قابیل بە هابیلی برای وت : دەبێ بتکوژم ، خوا دەفەرموێ هابیل وەڵامی دایەوە وتی « انما یتقبل الله من المتقین » خوا تەنها چاکەو خێری لەخوا ترسان وەردەگرێ ئەگەر تۆ پیاو چاك‌بوویتایە خوا قوربانی‌یەکەی لێ وەردەگرتی بەڵام خوا دەزانێ چی لە دڵە پیسەکەتدایە لە خراپەکاری‌و چەپەڵی .

پرسیاریَ لەخۆت بکە : بۆچی خوا قوربانی‌یەکەی لیَ وەرنەگرتی ؟ لەوە دەچیَ تاوانێکت کردبیَ ، پەشیمان بەرەوەو بگەڕێرەوە بۆ لای خواو داوی لێبووردنی لیَ بکە چونکە خوا زۆر لێبووردەیە بۆ کەسیَ داوای لێبووردنی لیَ بکات ، پاشان هابیلی لەخوا ترس بەردەوام بیری براکەی دەخستەوە کە خوای گەورە سزای بۆ ئەوانە داناوە کە لە سنوور دەردەچن‌و ستەم دەکەن .

وەپیَی وت : بۆیە خوا قوربانی‌یەکەتی وەرنەگرتووە چونکە لەخوا ترس‌و پیاو چاك نیت وەبیری خستەوە کە چ تاوانێك دەخاتە ئەستۆی خۆی ئەگەر بیکوژیَ ، وەترساندی لە سزای خوا لە رۆژی قیامەتدا ، وەدوای ئەم هەموو ئامۆژگاری‌و یاد خستنەوەو وریا کردنەوەیە ، دەروونی قابیل کوشتنی براکەی لاجوان‌و خۆشەویست کرد ، دوایش کە کوشتی لە زەرەر مەندان بوو ، براکەی لەکیس چوو ، وەتاوانێکی گەورەشی خستە ئەستۆی خۆی ، کوشتنی نەفسێکی بیَ تاوان بەناهەق ، وەقابیل وەستابوو سەیری تەرمی برا کوژراوەکەی دەکرد ، کە بوو بوو بەلاشەیەکی بیَ گیان کەهیچ جوڵەو ژیانی تێدا نەبوو .... چی لیَ بکات ؟ ئایا وازی لیَ بێنیَ‌و لە شوێنەکەی خۆی بەجیَی بهێڵیَ‌و بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە ؟ ... یا لەگەڵ خۆی هەڵی بگریَ‌و بیباتەوە بۆ ماڵەوە ؟ ... وە کەڕۆیشتەوە چی بە باوکە ئادەم بڵیَ ؟ ..

لەم ساتەدا کە قابیل لەگێژاوی بیرکردنەوەدا بوو ، خوای بیَ هاوەڵ‌و بیَ وێنە قەلە رەشێکی نارد تا فێری بکات کەچۆن لاشەی براکەی بشارێتەوە ، قەلە رەشەکە بەچکەکەی خۆی بەدەمەوە بوو هات زەوی هەڵکۆڵی بەچکەکەی تیَ کرد ، قابیلیش سەیری دەکرد ، لێرەدا قابیل هەستی بەبیَ دەسەلاتی‌و لاوازی خۆی کرد ، لە کاتێکدا ئەو وای هەست دەکرد کە زۆر بەتوانایە ، پاش ئەوەی براکەی کوشت ئەوەتا ئێستا دەسەلاتی ئەوەی نی‌یە کە زیرەکی ئەو قەلە رەشەی هەبیَ‌و چاڵیَ هەڵبکەنیَ‌و لاشەی براکەی تێدا بشارێتەوە ، کەچی ئەوەتا ئەو قەلە رەشە ئەو باڵدارە بچوکە لاوازە ، فێری دەکات چۆن لاشەکەی بشارێتەوە ... ئای کە قابیل بیَ دەسەلاتە : خوا دەفەرمویَ قابیل وتی : «يا ويلتنا اعجزت ان اكون مثل هذا الغراب فأواري سواة اخي فأصبح من النادمين » .. ئەی هاوار بۆ خۆم ئایا ناتوانم وەك ئەو قەلە رەشە تەرمی براکەم بشارمەوە ، پاش ئەوەی کوشتی پەشیمان بووەوە ، ئەمە یەکەم تاوانی کوشتنی مرۆڤ بوو لەسەر زەوی ..

## پەندو ئامۆژگاری:

١ـ خوای گەورە تەنها کردەوەی لە خوا ترسان وەردەگریَ کە دڵسۆزن لە پەرستن‌و عیبادەتەکەیاندا ، ئەوانەی کەکەس ناپەرستن‌بێجگە لە ( الله ) ئەوانەی کە بەکردەوەکانیان تەنها رەزامەندی خوایان مەبەستە ، وەهیچ شتێك تێکەڵ بەکردەوەکانیان ناکەن لەشیرك وەروپامایی ، لەبەر ئەوە خوای گەورە قوربانی‌یەکەی قابیلی رەت کردەوە ، وەپێویستە ئێمەش وەك هابیل هەر کردەوەیەکی چاکمان کرد تەنها لەبەر رەزامەندی خوا بێت ، چونکە ئەگەر لەبەر ئەوە بیَ کە لەدنیادا پێمان بڵێن خێرومەندە یا نوێژکەرە یا ئازایە ، خوا لەپاشەرۆژدا بەو جۆرە کەسانەی کەلەبەر خاتری خەڵك کردەوەی چاك دەکەن پێیان دەڵیَ بڕۆن لای ئەو کەسانە

پاداشت وەربگرنەوە کە خۆتانتان بۆ ماندوو کردوون، جا پێویستە زۆر ئاگاداری ئەوە بین کە ڕێگە نەدەین بەوەی کە پەرستنو کردەوەکانمان لەبەر ڕەزامەندی غەیری خوا بێت.

٢- کوشتنی نەفسێك بەناهەق لەتاوانە گەورەکانە، خوای گەورە دەفەرموێ: «ومن یقتل مؤمناً متعمداً فجزاؤە جهنم خالداً فیها وغض الله علیه ولعنه واعد له عذابا عظیما» النساء-٩٣-..

هەرکەسێ باوەڕدارێ بەئەنقەست بکوژێ ئەوە سزاکەی دۆزەخەو تاسەر تیایدا دەمێنێتەوە، وەخوا نەفرینی لێ کردوە لە بەزەیی خۆی بە دووری دەکات، وەسزایەکی گەورەی بۆ ئامادە کردووە، لە کاتێکدا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: (سوکترین سزای دۆزەخ پشکۆیەکە دەخرێتە ژێر قاچی کافرانەوە کە تەپڵی سەریانی پێوە دەکوڵێ) ئەی دەبێ سزا گەورەکەی چون بێت؟؟؟

وەپێغەمبەریش لەبارەی کوشتنی بەناهەقەوە دەفەرموێ (اکبر الکبائر الاشراك بالله، وقتل النفس وعقوق الوالدین) رواه البخاري.. (گەورەترین تاوان: هاوبەش پەیدا کردنە بۆ خوا، وەکوشتنی نەفسێکە، وەئازاردانی دایكو باوك)...

---

## تێبینی:

١- مامۆستا دەتوانێت هەر چیرۆکێکی تر کە شیاوو جێگای باوەڕ بێت بەپێی پێویست بۆ قوتابی باس بکات، بۆ نمونە: (هاوەڵانی ئەشکەوتەکە، چیرۆکەکانی ئاژەڵ لە قورئاندا .....) سەرنجی سەرچاوەکان بدەن..

٢- پێویستە مامۆستا پاش هەر وانەیەکی چیرۆك پەندو ئامۆژگارییەکانی لێ دەربهێنێ بۆ قوتابیو باسیان بکات یان سوودو کەڵکی چیرۆکەکە چییە باسی بکات..

---


### سەرچاوەکانی بەشی چیرۆكو داستان

١- قصص النبیین (ابو الحسن الندوی).
٢- المعامل الخفیة (عبدالکریم عبدالله رفعت).
٣- چیرۆکی پێغەمبەران.
٤- لە سەرە ڕێی کاروانی باوەڕ (صلاح الدین محمد).
٥- قصص الحیوان في القران الکریم (حامد حسین الفلاحي).
٦- زنجیرەکانی: لەگەڵ خوا ناساندا (حبیب محمد سعید).
٧- دوو کوڕەکە (محسن جوامێر).
٨- باوکە ئادەمو دایکە حەوا (محسن جوامێر).
٩- کەشتی نوح (محسن جوامێر)
١٠- زنجیرەکانی: دەستی پەروەردگار (حیب محمد سعید).
١١- ریاض الصالحین.

# و ـ بەشی فەرموودەکانی پێغەمبەری خۆشەویستمان

# (صلى الله عليه وسلم)

١ـ قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): (خيركم من تعلم القرآن وعلمه) رواه البخاري.
واتە: (باشترینتان ئەو کەسەیە کە قورئان فێر بووەو کەسانی تریش فێر دەکات).

٢ـ (يا غلام سم الله وكل بيمينك وكل مما يليك) متفق عليه.
واتە: (لە کاتی نان خواردندا ناوی خوا بهێنەو بەدەستی راست نان بخۆو لەبەردەم خۆتەوە بخۆ).

٣ـ (المسجد بيت كل مؤمن) صحيح الجامع الصغير رقم٦٧٠٢.
واتە: (مزگەوت ماڵی هەموو بړواداڕێکە).

٤ـ (اللهم اني أسالك الهدى والتقى والعفاف والغنى). رواه مسلم
واتە: (ئەی خوایە بەراستی من رێ روون بوونەوەو پارێزگاری (التقوى)و پاك داوێنیو قەناعەتو پێویستی هەر لەتۆ داوا دەکەم).

٥ـ (المؤذنون اطول أعناقاً يوم القيامة) صحيح الجامع الصغير ـ٦٥٢١.
واتە: (بانگ وێژان گەردنیان لە هەموو کەس درێژترە لەرۆژی دواییدا).

٦ـ (لايدخل الجنة قتات) متفق عليه.
واتە: (دوو زمان ناچێتە بەهەشت).

٧ـ (من قال لااله‌الاالله دخل الجنة) صحيح الجامع الصغير ـ٦٣٠٩.
واتە: (هەر کەسێ بەراستیو لەناو دڵەوە بڵێ «لااله‌الاالله» دەچێتە بەهەشتەوە).

٨ـ (ان الله جميل يحب الجمال) صحيح الجامع الصغير ـ١٧٣٨.
واتە: (خوای گەورە جوانەو جوانی خۆش دەوێت لەهەموو شتێکدا).

٩ـ (من لايرحم الناس لايرحمه الله) صحيح الجامع الصغير ـ٦٤٧٣.
واتە: (هەر کەسێك بەزەیی بەخەڵکدا نەیەتەوە خوای گەورەش بەزەیی بەودا نایەتەوە).

١٠ـ (لايحل لمسلم ان يهجر أخاه فوق ثلاث) صحيح الجامع الصغير ـ٧٥٣.
واتە: (بۆ هیچ موسڵمانێك دروست نییە لەسەرووی سێ رۆژ براکەی نەدوێنێ).

١١- (تبسمك في وجه اخيك صدقة) صحيح رواه الترمذي.
واته : ( روو خۆشيت بەدەم براى موسـڵمانتەوە خێرو چاكەيە ) .

١٢- (من كان يؤمن بالله واليوم الاخر فلا يؤذ جاره) رواه البخاري.
واتـه : ( هـەر كـەسـێك بـاوەڕى بـەخـواو بـەڕۆژى دواى هـەيـە بـائـازارى دراوسـێكـەى نەدات ) .

١٣- (الدعاء هو العبادة) رواه الترمذي وقال حديث حسن.
واته : ( نزاو پاڕانەوە خوا پەرستىيە ) .

١٤- (اية المنافق ثلاث اذا حدث كذب واذا وعد أخلف واذا ائتمن خان) متفق عليه.
واته : ( نيشـانـەى دوو روو سێ شتـە كـاتێ قسـەى كـرد درۆ دەكـات كـاتێ پـەيمانـىدا نايباتە سەر كاتێ ئەمانەتێكى پێدراناپاكى تێدا دەكات ) .

١٥- (اذا سمعت النداء فاجب داعي الله) صحيح الجامع الصغير-٦٢٢.
واته : ( كاتێ گوێت لە بانگ بوو بەدەم بانگەوازى خواوە بچۆ ) .

# ز — بەشى بەسەرهاتو ژيانى پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

## — كـورتـەيـەك لـەمێـژووى عـەرەب پـێش ئـيسلامو ژيـانـى پـێغـەمبـەرى پێشەوامان (صلى الله عليه وسلم):

پێشەكى : چەند ئامۆژگارىيەك بۆ مامۆستايان :
ئەركى سەرشانى مامۆستا گەياندنى بابەتەكانە بە شێوەيەكى پێويستو لەبەر چاو بـۆ ئـەو مـەبـەسـتـەش پـێويـسـتـە هـەمـوو هـۆيـەكـانـى روون كـردنـەوە بـگـرێـتـە بـەر وەزۆر بـابـەتـى لاوەكـى بـاس نـەكـرێـت تـازيـاتـر سـوود وەربـگـرنو تـووشـى وەڕس بـوون نـەبـن ، وەبـتـوانـن ئـەوەى بـاسـى دەكـات بـيـخـاتـە مـەيـدانـى واقـعو راسـتـيـەكـى بـەرچـاوو نـموونـە بهێنێتەوە بەو ژينگەيەى كەخۆيان تێيدا دەژين تا زياتر كەڵك وەربگرن بۆيە دەبێ ئەم خاڵانە رەچاو بكرێن .
١- ئاگادارى لەهەموو باسەكانى ئەم كتێبە .
٢- مەبەست لەخوێندنى ئەم كتێبە چىيە ؟
٣- دانـانـى بـەرنـامـەيـەكـى گـونـجـاو بـۆ وتـنـەوەى بـابـەتـەكـانـى ئـەم بـاسـە تـاهـەمـوو وانـەكـان بەيەكەوە ببەستێتەوە .
٤- گـەڕانـەوە بـۆ چـەنـد سـەرچـاوەيـەكـى تـايـبـەت بـەم بـاسـەوە بـۆ زيـاتـر شـارەزا بـوون لـە

ژیانی پێغەمبەری پێشەوامان (صلى الله عليه وسلم).
وەپێویستە بۆ وتنەوەی وانەکان ئەم خالآنە لەبەر چاو بگیرێت:
١) چەند شێوەیەکی جۆراو جۆر بۆ وتنەوەی وانەکان.
٢) ئامادەکردنی هۆیەکانی روون کردنەوەو چیرۆكو بابەتی تر وەك نەخشەو وێنەو... هتد..
٣) دیاری کردنی کاتی پێویست بۆ تەواو کردنی بابەتەکە، وەبەپێی توانا دەتوانێت بۆیان روون بکاتەوە، ئەو قوتابیانەی تەمەنیان مندالّە پێویستە کەمتر وەربگرن. تابتوان سوودی لێ وەربگرن.

## بابەتەکانی ئەم بەشە:

١. ژیانی عەرەب پێش هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام.
٢. ژیانی پێغەمبەری پێشەوامان.
٣. کاریگەری ئیسلام لەژیانی کۆمەڵدا.

(وانەی یەکەم):

# ژیانی عەرەب پێش ئیسلام:

## نیوەدوورگەی عەرەبو دانیشتوانی:

نیوە دوورگەی عەرەب دەکەوێتە خوارووی رۆژئاوای کیشوەری ئاسیاو لەزۆر لاوە بە ئاو دەورە دراوە، نیوە دورگەی عەرەب شوێنی نیشتەجێ بوونی عەرەب بووە هەر لەسەرەتاوە.

## عەرەبەکان دەکرێن بەدوو بەشەوە:

١) عەرەبی کۆچەریو گەڕۆك.
٢) عەرەبی نیشتەجێ وەکو دانیشتوانی مەککە، بیروباوەڕی عەرەب پێش ئیسلام بریتی بوو لە بت پەرستیو دابو نەریتی نەفامیو پەرتەوازەییو ...... هتد.

### پرسیار:

١- نیوە دوورگەی عەرەب دەکەوێتە کوێوە؟
٢- بیروباوەڕی عەرەب پێش ئیسلام چۆن بوو؟

## گەورە بوونی ئیسماعیل لەمەککەو دروست کردنی کەعبە

ناوچەی حیجاز دەکەوێتە رۆژئاوای نیوە دووورگەی عەرەبییەوە کە لەسەرەوە ولآتی شامو لە باشورەوە ولآتی یەمەنو لە رۆژئاواوە دەریای سوور هەیە، ناوچەی حیجاز شوێنی بازرگانی بووە چونکە هەموو کاروانە بازرگانییەکان لەو ناوچەیەوە تێ پەڕ بوون.
بەناوبانگترین شارەکانی هەرێمی حیجاز (مەکەو مەدینەن).
پێغەمبەر ئیبراهیم پێش چوار هەزار ساڵ لە ولآتی شامەوە کۆچی کرد بۆ مەککە

لەگەڵ هاجەری خێزانیو ئیسماعیلی کوڕی .
لەو کاتەدا مەککە شیو یەکی چۆڵی بێ ئاوی بێ کشتوکاڵ بوو کە بەچیا دەورە درابوو .
لەو ناوچەیەدا ئیبراهیم خێزانەکەیو کوڕەکەی بەجێ هێشتو گەڕایەوە بۆ فەلەستین ، وەداوای کرد لە پەروەردگار کە بەزەیی خۆی بڕێژێ بەسەریاندا ، وەخوای گەورە ئاوی زەمزەمی بۆ دەرخستنو تائێستاش هەر ماوە ، هەر لەو رۆژگارەوە هۆزەکانی دەوروبەر کۆچیان کرد بۆ لای ئاوەکەو ناویان نا ( ام القری ) .
کاتێك ئیسماعیل گەورە بوو ژنی هێناو نەوەکانی زۆر بوون ، وەباوکی سەردانی دەکردن لەمەککە لەو کاتەدا خوای گەورە فەرمانی پێدان کە ( کەعبە ) دروست بکەن ، وە کەعبەیان دروست کرد ، پاشان خوای گەورە وەحی نارد بۆ ئیبراهیم ( سەلامی خوای لێ بێت ) کە داوا بکە لە خەڵك بێن بۆ حەج کردنو سەردانی کەعبە کە بۆ مەبەستی خوا پەرستی دروست کراوە ، لەو کاتەوە تا ئێستا مەککە شوێنێکی پیرۆزەو موسڵمانان لە سەرانسەری جیهانەوە سەردانی دەکەن .

## پرسیار ؟

١ـ هەرێمی حیجاز دەکەوێتە کوێی نیوە دوورگەی عەرەبییەوە ؟
٢ـ حەزرەتی ئیبراهیم لە کوێوە هات بۆ حیجاز ؟
٣ـ مەککە شوێنێکی چۆن بوو کە ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) هات.
٤ـ مەککە چۆن ئاوەدان بۆوە.
٥ـ حەزرەتی ئیبراهیمو کوڕەکەی چییان دروست کرد لەمەکە ؟ وەبەفەرمانی کێ ؟
٦ـ بۆچی موسلمانان سەردانی مەککە دەکەن.

## وانەی دووەم :

# دەسەڵاتداریتی قورەیش

هۆزی قورەیش هۆزێکی عەرەبنو لە ناوچەی مەککەدا نیشتەجێ بوون ، وەنەوەی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمن ( سەلامی خوای لێ بێت ) .
دەسەڵاتی ئایینیو بازرگانی لەناوچەکەدا بەدەست قورەیشەوە بوو ، وەدانیشتوانی نیوە دوورگە لە هەموو لایەکەوە دەهاتنە مەکە بۆ سەردانی کەعبەو بازرگانی قورەیش ، بازرگانی لەگەڵ ولاتی شامو یەمەندا دەکرد ، لە زستاندا بۆ ولاتی یەمەنو لە هاویندا بۆ ولاتی شام .
خوای گەورە دەفەرموێت : « لإیلاف قریش ، إیلافهم رحلة الشتاء والصیف ... » .
کاتێك سەرۆکایەتی مەککە کەوتە دەست ( قوصەی کوڕی کلاب ) باپیری چوارەمی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) ناوبانگی دەرکردو زۆر کاری گرنگی ئەنجامدا بەهۆی زیرەکیو لێ هاتوویی خۆیەوە لەگرنگترین ئەم کارانە :
١ ) دابین کردنی باری گوزەرانی دانیشتوانی مەکە .
٢ ) ( دار الندوة )ی دروست کرد بۆ کۆبوونەوە لەهەموو کاتێکی پێویستدا بۆ جێ بەجێ کردنی کارەکانیان .

٣) جارێکی تر کەعبەی دروست کردەوە وەئاوەدانی کردەوە لە کاتێکدا زۆر لە پایەکانی رووخا بوو.
٤) دابین کردنی خواردنو خواردنەوە بۆ حاجیە هەژارەکان کە دەهاتن بۆ سەردانی مەککە.

## پرسیار؟

١. بەناوبانگترین هۆز کە لەمەککە نیشتەجێ بوون کێ بوو؟
٢. بۆچی قورەیش سەرکردەی هۆزەکان بوو؟
٣. بۆچی هۆزی قورەیش بازرگانیان دەکردو کشتوکالیان نەدەکرد؟
٤. لەو ولاتانە کێ بوون کە قورەیش بازرگانی لەگەڵ دەکردن؟
٥. گرنگترین کارەکانی (قوصەی کوڕی کلاب) بژمێرە؟

## وانەی سێهەم

## باری ئایینی لە نیوە دوورگەی عەرەب پێش ئیسلام

لە مەکەدا خوا پەرستی لە ئیبراهیمەوە دەستی پێ کردو شوێن کەوتووانی هەر مانەوە، وەپێیان دەووتن (الحنفاء) واتە (پاکژەکان).
بەلآم بەدرێژایی رۆژگار دانیشتوانی ناوچەکە لەو ئایینە دوور کەوتنەوەو کەوتنە پەرستنی زۆر شتی تر بێجگە لە خوای پەروەردگار.
زۆر ئایینی نامۆ بلآو بۆوە لەهەر ناوچەیەك شتێکیان دەپەرست، کۆمەڵێکیان وتیان ئێمە جولەکەینو لەسەر ئایینی (موسی) دەڕۆین، کۆمەڵێکیان وتیان ئێمە گاورین وەلەسەر ئایینی (عیسی) دەڕۆین، ئەوانی تریش کۆمەڵێکیان مانگو رۆژو ئەستێرەیان دەپەرست، کۆمەڵێکیان ئاگر پەرست بوونو کۆمەڵێکیان داروو بەردیان دەپەرست، زۆر کەمیان لەسەر ئایینی خوا پەرستی مابوونەوە.
بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت کە دانیشتوانی نیوە دوورگەی عەرەب پێش ئسلام چەندەها ئایینو پەرستگایان هەبووە.

## پرسیار؟

١. ئایا دانیشتوانی نیوە دورگە لە سەرەتاوە بتیان پەرستووە؟
٢. لە سەرەتای دروست کردنی کەعبەدا چیان دەپەرست؟
٣. ئەم بۆشاییانە پڕ بکەرەوە؟
١) شوێن کەوتوانی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) پێیان دەوترێت ................
٢) شوێن کەوتوانی موسی (سەلامی خوای لێ بێت) پێیان دەووترێت ..............
٣) شوێن کەوتوانی عیسی (سەلامی خوای لێ بێت) پێیان دەوترێت ..............
٤) شوێن کەوتوانی محمد (صلی الله علیه وسلم) پێیان دەوترێت ...........

## باری کۆمەلآیەتی عەرەب پێش ئیسلام

عەرەب لەپێش ئیسلامدا لەچەند هۆزێك پێك هاتبوون کە هەر هۆزێك لە چەند

خێزانێك پێك دەهات، وەهەر هۆزێك سەرکردەیەکیان هەبوو بەتێکرا گوێ رایەڵیان دەکرد.
وەهۆزەکان لەناو خۆیاندا دژایەتی یەکتریان دەکردو وەهەر یەکەیان بەرگری لە هۆزەکەی خۆی دەکرد.
وەزۆر رەوشتی ناپەسەندیان هەبووە لەپێش ئیسلامدا وەك (زینا کردن، زیندە بەچاڵ کردنی منداڵ، کوشتن، سوو خواردن (الربا)، ئارەق خواردنەوە، قومار کردن، .......) وەهەندێك رەوشتی وەك پیاوەتیو بەخشندەییو ئازایەتیو بەوەفایی هەبووە لەناویاندا.

## پرسیار؟

١. هۆز لەچی پێك دێت؟
٢. کێ سەرپەرشتی هۆزی دەکرد؟
٣. بۆچی ئاژاوە لەنێوان هۆزەکاندا دروست دەبور؟
٤. ئەو رەوشتە ناپەسەندانە چی بوون کە لەناو هۆزەکاندا هەبوون؟

# ژیانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

## وانەی چوارەم:

## لەدایك بوونی پێغەمبەر:

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەشاری مەککە لەرۆژی دوو شەممەی (١٢)ی رەبیعی یەکەمی ساڵی ٥٧١ زایینی رێکەوتی ساڵی فیل لەدایك بووە(*).
کاتێك لەدایك بوو (عبدالمطلب)ی باپیری زۆر خۆشحاڵ بوو ناوی نا (محمد)، (عبدالله)ی باوکی (محمد) لەباشترین لاوەکانی مەککە بوو وەئامینەی کچی وەهەبی داواکردو بووە خێزانی، دوای ماوەیەك لەژن هێنان عبدالله بۆ مەبەستی بازرگانی سەفەری کرد بۆ وڵاتی شام لەکاتی گەڕانەوەدا نەخۆش کەوت، چوو بۆ یەثریب بە مەبەستی چارەسەر کردن، بەڵام هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد، پێش لەدایك بوونی (محمد) بەحەوت مانگ (محمدی کوڕی عبدالله کوڕی عبدالمطلب کوڕی هاشم کوڕی عبدالمناف کوڕی قوصەی کوڕی کلاب کە لە نەوەی ئیسماعیلە) سەلامی خوای لێ بێت..
وەدایکی ئامینەی کچی وەهەب کوڕی عبدالمناف کوڕی زهرە کوڕی کلاب بووە.

## پرسیار؟

١. کەی محمد (صلی الله علیه وسلم) لەدایك بووە؟
٢. باوکی پێغەمبەر ناوی چی بوو؟
٣. دایکی پێغەمبەر ناوی چی بوو؟
٤. باوکی پێغەمبەر چۆن وەلەکوێ کۆچی دوایی کرد؟
٥. هەڵویستی عبدالمطلب چی بوو کە محمد لەدایك بوو؟

---

(*) مامۆستا باسی رووداوی فیل دەکات بۆ قوتابییەکانی.

## بەخێو کردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

لەدوای لەدایك بوونی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) تاماوەیەك دایکی شیری دایە وەبەخێوی کرد پاشان درا بەدایەن کەشیری بداتێ ، ئەو ئافرەتەش ( حەلیمەی سەعدییە ) بوو لەگەڵ خۆیا بردی بۆ دەشت بۆ ناو هۆزی ( بەنی سەعد )و تاماوەی چوار ساڵ مایەوە ، لەو ماوەیەدا حەلیمە محمدی لەگەڵ خۆی هێنا بۆ لای دایکی تادڵ ئارام بێت بەبینینی .

کاتێك محمد تەمەنی گەیشتە شەش ساڵ دایکی لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ ماڵی خاڵوانی لە ( یەثریب ) لەکاتی گەڕانەوەدا دایکی مرد لەرێگاداو لە ( ئەبواء )( * ) بەخاك سپێردرا .

لەو ڕۆژەوە محمد بە هەتیوی مایەوە بێبەشبێ باوكو دایك ، بەڵام باپیری واتە ( عبدالمطلب ) بەخێو کردنو پەروەردە کردنی گرتە ئەستۆی خۆی ، وەزۆری خۆش دەویستو بەردەوام لەگەڵ خۆیدا دەیگێڕا .

کە محمد تەمەنی گەیشتە هەشت ساڵ ( عبدالمطلب )ی باپیری ماڵ ئاوایی لەژیان کردو کۆچی دوایی کرد .

( ابو طالب ) محمدی هێنایە لای خۆی هەرچەند خێزانی زۆر بوو وەهەژار بوو بەڵام وەکو کوڕەکانی خۆی سەیری دەکرد ، محمد ئەبو طالیبی مامی زۆر خۆش دەویست هەر بۆیە ئەبو طالیب لەسەفەری شامدا محمدی لەگەڵ خۆی بردو لەکاتێکدا محمد تەمەنی منداڵ بوو وەرێگاش دوور بوو .

### پرسیار؟

١. شیردەری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ناوی چی بوو؟
٢. پێغەمبەر ماوەی چەند لەناو (بەنی سەعد) مایەوە؟
٣. محمد تەمەنی چەند بوو کەدایکی کۆچی دوای کرد؟
٤. دوای مردنی باپیری محمد کێ محمدی بەخێو کرد؟

---

(*) (ئەبواء) شوێنێکە لەنزیك مەدینە.

# ژن هێنانی پێغەمبەر (صلی‌اللەعلیەوسلم) بۆ یەکەم جار

## وانەی پێنجەم:

## محمدو خەدیجەی خێزانی

محمد دەیزانی کە (ئەبو طالیب) هەژارەو توانای بەخێوکردنی ئەو خێزانە زۆرەی نییە، ویستی یارمەتی بدات، هەر لەمناڵییەوە دەستی کرد بەشوانیو بەخێو کردنی مەڕو ماڵات لەمەکەدا بەکرێیەکی زۆر کەم، لەتەمەنی سیانزە ساڵیدا لەگەڵ مامی دەستی کرد بە سەفەر کردن بۆ بازرگانیو لەناو گەلەکەیدا بە (ئەمین) واتە دەست پاك ناوی دەرکردبوو وەزۆر راستگۆ بوو، لەمەکەدا ئافرەتێکی خاوەن رێزی دەوڵەمەند هەبوو ناوی (خدیجەی کچی خویلد) بوو کە هەستی کرد بەدەست پاکیو راستگۆیی محمد کردی بەهاوبەشی خۆی لەبازرگانیدا، وەبازرگانی بۆ خەدیجە دەکرد قازانجێکی زۆری کرد، وەخەدیجە یەکێك لەکارەکەرەکانی خۆی کەناوی (مەیسرە) بوو لەگەڵ محمد ناردی بۆ شام، هەموو جارێك دوای گەڕانەوە (مەیسرە) باسی دەست پاکیو راستگوییو رەوشت بەرزی محمدی بۆ خەدیجە دەگێڕایەوە، کاتێك خەدیجە ئەو هەموو رەوشتە جوانەی لە محمد بینی ئاواتەخواز بوو کە ببێتە هاوسەری ژیانی محمد، دوای ئەوە ئەبو طالیب داوای خەدیجەی کرد بۆ محمد لە کاتێکدا کە تەمەنی خەدیجە (٤٠) چل ساڵ بوو، وەتەمەنی محمد (٢٥) بیستو پێنج ساڵ بوو.

خەدیجەو محمد بەیەکەوە ژیان ماوەی بیستو پێنج ساڵ، وەهەموو منداڵەکانی (*) پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەخەدیجە بوون جگە لە ئیبراهیم.

بەڕاستی خەدیجە باشترین هاوسەرو یاریدەدەر بوو.

## پرسیار؟

١- محمد چۆن هاوکاری مامی دەکرد لەژیاندا؟
٢- ئەو کارانە چی بوون کە محمد لە منالیو لاویدا دەیکردن؟
٣- بۆچی محمد ناوی بەدەست پاکی بلاو بۆوە؟
٤- یەکەم هاوسەری محمد ناوی چی بوو؟
٥- بۆچی خدیجە محمدی پسەند کرد؟
٦- منالەکانی پێغەمبەر ناویان چی بوو؟

## دروست کردنەوەی کەعبە

کاتێك دانیشتوانی مەککە زانیان (کەعبە) خەریکە دەڕوخێت بڕیاریاندا کە لەنوێوە دروستی بکەنەوە، هەموو هۆزەکانی ئەو ناوچەیە بەشداریان کرد لەدروست کردنەوەی کەعبەدا، تاگەیشتنە دانانەوەی بەردە رەشەکە (الحجر الأسود) هۆزەکان کەوتنە کێشەوە کامیان دای بنێت، وەئەو رێزەی پێ ببەخشرێت، پاشان

بڕیاریاندا کەهەر کەسێك یەکەم جار هاتە ژوورەوە باناو بژێیان بکات، یەکەم کەس لەدەرگاوە هاتە ژوورەوە محمد بوو (صلی الله علیه وسلم) کە ئەو کاتە تەمەنی (٣٥) سیو پێنج ساڵ بوو، هەموو وتیان محمد دەست پاكو راست گۆیە بەفەرمانی ئەو رازی دەبین، وەئاگاداریان کرد لەکێشەکەو ئەویش پارچەیەك قوماشی راخستو بەردەکەی خستە سەر، وەپێی وتن هەریەك لە هۆزەکان لایەکی ئەم پارچە قوماشە بگرنو بەرزی بکەنەوە، پاشان خۆی بەردەکەی هەڵگرتو لەجێگای خۆی داینا، وەهەموویان رەزامەندی خۆیان دەربڕی، ئەمەش بەڵگەی ژیریو دانایی پێغەمبەر بوو (صلی الله علیه وسلم).

## پرسیار؟

١- قورەیشییەکان بڕیاری چییاندا کەبینییان کەعبە خەریکە دەڕوخێت؟
٢- هۆزەکان لەسەر چی کێشەکە کەوتە نێوانیان؟
٣- کێ بوو چارەسەری کێشەکەی بۆ کردن؟ وەچۆن؟
٤- ئەم رووداوە چ کاتێك بوو؟

---

(*) منالەکانی پێغەمبەر لە خەدیجە (القاسم، عبدالله الطاهر، روقیة، زەینەب، ئوم کلثوم، فاطمة).

## وانەی شەشەم:

# هاتنی پەیامی خوایی بۆ محمد

محمد لەناو گەلەکەیدا دەژیاو هۆگری یەکتری بوون، هاوکاری دەکردن لەهەموو کارێکدا، لەسودی گەلەکەی بەشدار بوو.

دانیشتوانی مەککە زۆر خۆشیان دەویستو پارێزگارییان دەکرد، بەڵام محمد لەبیروباوەڕی گەلەکەی رازی نەبوو وەبەشداری رەوشتە نابەجێو ناپەسەندەکانی نەدەکردن، وەکو بت پەرستیو ئارەق خواردنەوەو قومار کردنو... هتد، زۆر پێی ناخۆش بوو وەدوورە پەرێز بو لەگەلەکەی لەسەر ئەو رەوشتانە، مەگەر بۆ کارێك کەخزمەتی گشتی تێدا بێت، لەسەر ئەوە بڕیاری دەدا بەتەنیا کاتەکانی بەسەر بەرێت وەزیاتر بیر بکاتەوە بۆ مەبەستی بیرکردنەوە ئەشکەوتێکی بچوکی لەکێوی (نوور) هەڵبژارد کە ناوی ئەشکەوتی (حراء) بوو، چیای نوور لەمەککەوە ماوەی سێ میل دوور بوو، ئەشکەوتی (حراء) بچوكو تاریك بوو دوای نیوکات ژمێر سەرکەوتن بەچیای نووردا دەگەیستە ئەشکەوتەکە، لەڕەوشتی محمد وابوو کە هەموو ساڵێك ماوەی یەك مانگ لەو ئەشکەوتەدا دەمایەوە خوا پەرستی دەکرد لەسەر ئاینی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت).

لەشەوی حەفدەی رەمەزانی ساڵی (٦١١)ی زایینی پەروەردگار جبرائیلی نارد بۆ لای محمد کەلەو کاتەدا تەمەنی (٤٠) چل ساڵ بوو، پێغەمبەری خوا دەفەرموێت (جبرائیل هات گوشیمی بەسنگیەوە سێ جارو هەموو جارێك پێی دەگوتم: بخوێنە؟ لەوەلامدا وتم: خوێندەوار نیم! لەجاری دواییدا پێی ووتم: «إقرأ باسم ربك الذي

خلق ، خلق الانسان من علق ، إقرأ وربك الاكرم ، الذي علم بالقلم ، علم الانسان مالم يعلم » .
پاشان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دووبارەی کردەوە گیانی دەلەرزی‌و سەری سووڕما بوو لەو رووداوە بەترس‌و لەرزەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە .

## پرسیار؟

١- پەیوەندی پێغەمبەر چۆن بوو لەگەڵ دانیشتوانی مەککە؟
٢- جبرائیل چی وت بەپێغەمبەر لە ئەشکەوتی (حراء)؟
٣- ئەشکەوت (حراء) کەوتۆتە کوێ‌وە؟
٤- لەچ کاتێکدا بوو کە پەیامی خوایی بۆ محمد هات (صلی الله علیه وسلم)؟

# ناردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ ناو گەلەکەی

کاتێك کەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە هەموو گیانی دەلەرزی ، لەو رووداوە کە پێشتر رووی‌دا شتیی وای نەبیستبوو ، بەخێزانەکەی وت : دامپۆشن ، خەدیجە پێغەمبەری خوای داپۆشی‌و پرسیاری لێ کرد بۆچی وات لێ هاتووە؟ ئەویش هەموو باسەکەی بۆ گێڕایەوە وەچۆن تووشی ترسان‌و لەرزین بووە لەکاتێکدا کە جبرائیل (سەلامی خوای لێ بێت) گرتوویەتی‌یە باوەشی .
خەدیجە (رەزای خوای لێ بێت) دڵخۆشی پێغەمبەری دایەوەو دڵی ئارام کردەوە وەپێی وت کە تووشی خێرێکی گەورە دەبیت ، بۆ ئەم مەبەستە چوو بۆ لای (وەرەقەی کوڕی نەوفل) کە کوڕی مامی خەدیجە بوو ، هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە ، وەرەقە زۆر شارەزا بوو لە ژیانی پێغەمبەران‌و ئایینە پێشووەکان بۆیە بەخەدیجەی ; ئەم پەیامە پەیامێکە پێشتر بۆ موسی هاتووە ، وەئەم پیاوە دەبێتە پێغەمبەر لەناو گەلەکەیدا ، باچاوەڕوان بکات وە خۆگر بێت بەرامبەر ئەنجامەکەی .
خەدیجە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە هەواڵەکەی وەرەقەی کوڕی نەوفلی گەیاند بەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەخۆشی باوەڕی پێ هێنا ، خەدیجە بوو یەکەم کەس کە باوەڕی هێنا .

## پرسیار؟

١- کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گەڕایەوە بۆ ماڵەوە گیانی دەلەرزی، خەدیجە چی کرد؟
٢- بۆچی خەدیجە چوو بۆ لای (وەرەقەی کوڕی نەوفل)؟
٣- کێ بوو یەکەم کەس باوەڕی هێنا؟

## ح — بەشی سروود:

### تێکۆشان

منداڵینو لەسەر خۆین
وابەرەو ئاسۆ دەڕۆین
لەکاروانی تێکۆشان
سروود دەڵێین بۆ ژیان
بەدڵ ڕێگای حەق دەگرین
فەرمانی خوا رادەگرین
بەخوێندنو بەرهەممان
رووناك دەكەین بەردەممان

سەردار رەزا

### سوپاس بۆ خوا

سوپاس بۆ خوای میهرەبان
لەسەر نیعمەتی ئیمان
سوپاس بۆ تۆ پەروەردگار
کردوتین بەبڕوادار
کەوا ئیسلامەمان ناسی
دەستمان کرد بەخواناسی
کەمەست دەکەین تۆ تەنهای
بەتەنها تۆ بەتوانای
ئەگەر هەتاکو مردن
بکەوینە سوپاس کردن
لەسەر نیعمەتی ئیمان
هێشتا کەمە خوایە گیان

أ. کاروانی

### ئیسلامەڕیم

لەهەر کوێ بم دوژمنان
موسڵمانم ... موسڵمانم
ئیتر بێ هیوابن لێم
ئیسلامە ئیسلامەڕێم
کاتێ لەسەر ماڵو ڕێم
بەدەست ئێوە دەردەکرێم
کەدەمکەن بە ئاوارە
دەمم هەر بەهاوارە

ئیتر بێ هیوابن لێم
ئیسلامە ئیسلامەڕێم
لەخۆشیو ناخۆشیدا
لەساغیو نەخۆشیدا
هەرچەند کەوا هەژار بم
لەم ژینەدا نەداربم
ئیتر بێ هیوابن لێم
ئیسلامە ئیسلامەڕێم
ڕۆژێ دێ دەبمە سەرباز
بۆ ئیسلام دەبمە گیانباز
ئەوسا دەزانن من کێم
یانی چی ئیسلامەڕێم

أ. کاروانی

# دەمەتەقێی باوكو منداڵ

منداڵ:

باشە بابە گیان ئەو سێوە جوانە
ئەو میوەهاتو ئەو دەغڵو دانە
چۆن دروست دەبێ بەو شێوەی
هەیە
دەست کردە یاخود ئیشی
کارگەیە ؟!

باوك:

ڕۆڵە : کەی کارگە کاری وادەکات
مرۆڤ تا ماوە دروستی ناکات
گەر هەموو خەڵکی بۆی بکەونە
کار
ناتوانن دروست بکەن یەك هەنار

منداڵ:

ئەی ئیشی کێیە ؟ ئەونە توانایە !
لە هەموو کەسێ زیاتر زانایە
خۆزگە ، بابە گیان ئەوم دەناسی
تا بەرێزەوە بکەم سوپاسی

باوك:

ڕۆڵە ئەو کەسە زاتی ( الله )یە
بەدی هێنەری هەموو دنیایە
بچۆ بپرسەو بخوێنە باسی
کاری بۆ دەکەی کەچاکتر ناسی

## بابە

بابە باوکی بەرێزم
تۆی پشتیوانو هێزم
سەبەبی خۆشیو ژینم
ڕێ پیشان دەری دینم
خودام پێ دەناسێنێ
نەزانیم دەرەوێنێ
هەروەکو هاوڕێم وایە
ڕێزی یەکترمان لایە
ئەرکی خۆی بەجێ دێنێ
پەراووم بۆ دەخوێنێ
فێری نوێژیشی کردووم
بۆ مزگەوتیشی بردووم
شتێکی دێتە بەرچاو
بۆمان باس دەکات تەواو
لایەنی خراپو چاك
دڵمان پێی دەبێ ڕووناك
ئێمەش دەکەین پرسیار
گەر نەزانین جارو بار
تا لەیەکتر تێ دەگەین
بەم شێوەیە پێ دەگەین

## خوشكو براین ـ بەندەی خوا

فێر کردنو پەروەردە
سارێژ کردنی دەردە
دەست خستنە ناو دەستو هێز
بۆت دێنێ سەربەرزیو ڕێز
دەفەرمون : بایەك گرین
ڕێگەی قورئانێ بگرین
یەك یەك مافمان دەداتێ
هیچ ڕێگایەك نایگاتێ
خوشكو براین ـ بەندەی خوا
باخۆ بەزلزان بروا
کارێ بگرینە ئەستۆ
خزمەتمان بکات ئەمرۆ
گەورە .. خزمەت کاریکا
لەگەڵ منداڵ ... یاریکا
نان بخوا ... لەگەڵ هەژار
ببڕێ دەستی دز .. زۆردار

بژی وەکو هەژاری
نەك لە کۆشك و تەلاری
لەو گەورە کۆ بینەوە
ڕێگای خوا بگرینەوە

---

## ڕووم لەخێرکە

بابە گیان ڕووم لەخێرکە
تۆخوا قورئانم فێرکە
من بەروحو بەگیانم
تەواو شەیدای قورئانم
بابە گیان دەی خێراکە
مامۆستام بۆ پەیداکە
باقورئانم پێ بێژێ
نەونەمامم بدێژێ
بابە گیان دەی فرسەتە
دەست خەینە ئەو ڕەحمەتە

---

## تۆخوا ئەی بابەو دایە

تۆخوا ئەی بابەو دایە
گەر ڕێزی منتان لایە
کردەوەی جوانم فێرکەن
دڵو دەروونم تێرکەن
نەك تەنها پارەو خواردن
جلی جوان لەبەرکردن
ئەمە سەدەی بیستەمە
هەتا بزانین کەمە
کردەوەو ڕەوشتی جوان
تاجن بۆ سەری ئینسان

---

## مامۆستای دڵسۆز

ئەی مامۆستای دڵسۆزم
ئەی هەمیشە بەسۆزم
بە ئەدەب گوێت لێ دەگرم
ئامۆژگاریت وەردەگرم
چونکە خۆت کردەت جوانە
وشەت نەرمو نیانە
دڵت پڕ نووری خوایە
بەڕێزیت ئاشکرایە
پەروەردەت قورئانییە
مەبەستت ئینسانییە
وشەی دڵت بۆ دڵە
وانەت پڕ بۆنی گوڵە
چیم بۆ باس کەی فێر دەبم
تووشی هەزار خێر دەبم
قوتابیان خۆشیان دەوێ
لەیادماندای لەسەر کوێ
ئەوەی کەخۆی تەواوە
فەرمانی لەسەر چاوە
منیش ئەمرۆ منداڵم
هەروەکو میوەی کاڵم
سبەی کاتێ پێ دەگەم
خۆم وەکو تۆ لێدەکەم
منیش دەرس دەڵێمەوە
لەڕێی خوا دەتوێمەوە

---

## چۆن خودا بکەم ڕازی

بابە فێرم کە قورئان
دایە .. ئامۆژگاری جوان
کاکە گیان .. پەندم دەوێ
گیان بێ فێربوون ناسرەوێ
ڕەوشتی بەرزو ئەدەب
بۆ ماڵو گەڕەك .. مەکتەب
وشەی جوانو کردە ی چاك
دڵو دەروونێکی پاك
فێرم کە .. چاکە خوازی
چۆن خودا بکەم ڕازی
بابە .. دایە .. یارمەتی
زۆر پێویستم پێیەتی

ژیان دیاری خوا گیانە
بەکۆشش ... ئاوەدانە

---

# المنهج التربوى للأطفال

المرحلة الاولى

اعداد / محمد سينموكى

الطبعة الثالثة

ژمارەی سپاردن لە کتێبخانەی نیشتمانی کوردستان (١٢٩) ساڵی ١٩٩٦ ز

چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین / هەولێر